ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم 3

# تامەزرۆی ناسینی پێغەمبەرم ﷺ

بۆچی پێغەمبەر ﷺ هێندە گرنگە بۆ مرۆڤایەتی؟ پێغەمبەرمان ﷺ بۆچی لە شاری مەککە لەدایک بوو؟ ئایا پێغەمبەرمان پەرستشی ئەنجام دەدا پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەر؟ بۆچی کاتێک ناوی پێغەمبەر ﷺ دێت بۆ دەبێ صەلاوات بدەین؟ بۆچی پێغەمبەرمان ﷺ خوێندەواری نەبوو؟ ئایا پێغەمبەرمان ﷺ وەک پێغەمبەرانی تر موعجیزەی هەبوو؟ ئایا پێغەمبەرمان ﷺ منداڵانی خۆشدەویست؟ باشە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ چییە؟ بۆچی هێندە بایەخدارە؟ ئایا پێغەمبەرمان ﷺ لەم سەردەمەدا لە ژیاندا بوایە تەلەفۆنی بە سەرەوە پاک دەکردەوە یاخود قەڵەمی تەلی بەکاردەهێنا؟

ئۆزکان ئۆزە

با پرسیارەکانتان
بێ وەڵام
نەمێننەوە!

و: ئاوات عبداللە بابان



ناوی کتێب: تامەزرۆی ناسینی پێغەمبەرم ﷺ
نووسەر: ئۆزکان ئۆزە
وەرگێڕ: ئاوات عبداللە بابان
تیراژ: (٢٠٠٠) دانە
نۆبەی چاپ : یەکەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١١٢١)ی ساڵی٢٠١٢ی پێ دراوە

---

پەرتووکی سێیەم لە زنجیرەی

(ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم)

# تامەزرۆی ناسینی پێغەمبەرم ﷺ




نووسینی

ئۆزکان ئۆزە

وەرگێڕانی

ئاوات عبداللە بابان



چاپی یەکەم

١٤٣٣ک - ٢٠١٢ز

## ئەو پرسیارانەی ئامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم



# پێشەکی

پاش لە چاپدانی دوو بەرگ لە پەرتووکی (تامەزرۆی ناسینی خودام)، کە پێکهاتبوون لە وەڵامی ئەو پرسیارانەی لات گەڵاڵە بوو بوون، ئیدی ئێستاش نۆبەی زانینی وەڵامی پرسیارەکانی سەبارەت بە پێغەمبەرمانﷺ هاتووە.

ڕاستتر بڵێین؛ پاش ئەو سەرکەوتنە مەزنەی هەردوو بەرگی پێشوو بەدەستیان هێناو ئەو داواکارییە زۆرەی لەسەریان هەبوو پێکەوە لەگەڵ برادەرانی چاپخانە دانیشتین و نەخشە پلانێکمان کێشا.

بەپێی ئەو نەخشە پلانەش زنجیرەی (ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم) بەردەوام دەبێت.

دواتریش هەوڵدەدەین لەسەر بابەتگەلێکی وەك قورئانی پیرۆز، فریشتەکان، ژیانی پاش مردن، ئایینی ئیسلامو، بابەتی قەزاو قەدەر بدوێین...

لەم پەرتووکەی کە لەبەردەستاندایەو ژمارەی سێیەمی زنجیرەکەیە، هەوڵم داوە وەڵامی چەند پرسیارێك بدەمەوە دەربارەی پێغەمبەرمان موحەمەدﷺ، ئامانجم تەنها بریتی نییە لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانت و ڕەواندنەوەی تاسەمەندییەکەت.

هەندێ کەس تەنها بە هەژمارکردنی، پێغەمبەرمانﷺ وەك یەکێك لە پێغەمبەرانی دیکە کە بە درێژایی مێژوو هاتوون بۆ گرۆی مرۆڤایەتی و کەسایەتیەکی مەزنی نێو کەسایەتییە دیارەکان دەناسن.

لەحاڵێکدا ئەو، پێغەمبەری ئازیزی ئێمەیە. ژیانی ئەو، کە سەردەمەکەی خۆی و پاش خۆی کرد بە پارچەیەك لە خۆشگوزەرانی، ژیانێکە کە دووتوێی مێژوویەك بەس نیە بۆ جێ بوونەوەی.

فەرموودەیەکی ئەو، یادەوەرییەکی بچووکی تایبەت بەو، دەبێتە ڕووناکی ڕاستە شەقامی ژیانمان تاکو بەهەشت.

پاش خوێندنەوەی ئەم پەرتووکە ئومێدەوارم جێگای پێغەمبەرمانﷺ لە ژیانتدا زیاتر دیاربێت و تۆش هەست بە نزیکی زیاتر بکەیت لەو زاتە...

پێدەچێت نەتوانم مافی خۆی بدەمێ... وەڵێ من هەموو دەستەواژەیەکم بەو ئومێدەوە دروستکردو هەموو ڕستەیەکم بەو ئومێدەوە نووسی...

ئومێد کردن نزایە! وەرن پێکەوە بۆ هاتنەدی ئومێدەکانمان پێکڕا بڵێین:"ئامین"!.

**ئۆزکان ئۆزە**



**خوای گەورە دەفەرموێت:**

(( بەڕاستی لە لایەن خوداوە پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە کە لە خۆتانەو هاونیشتمان و هاوزمانتانەو، زۆری پێ ناخۆشە تووشی ناڕەحەتی ببن، زۆر حەز ئەکات لە خێرو خۆشیتان و، لەگەڵ موسوڵمانان بەبەزەیی‌و میهرەبانە.)) التوبة:١٢٨.

# پێغەمبەر ﷺ

## بۆچی بۆ مرۆڤایەتی هێندە گرنگە؟



ئێمە چاومان هەڵهێناو خۆمان لە دونیایەکی سەرسوڕهێندا دیتەوە. هەروەك چۆن هەموو پێداویستیەکانی کۆرپەیەك، بە لەدایك بوونی خۆی، بۆی ئامادە دەکرێت، ئێمەش بەهەمان شێوە هەموو پێداویستییەکمان لەم دونیا سەرسوڕهێنەدا بۆ ئامادە کراوە...

خۆرە بەنازەکەی ئاسمان لەلایەکەوە ڕۆژگارمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، لەلایەکی دیکەوە ئەم خانە گەورەیەشمان بۆ گەرم دەکاتەوە. بەمانای ئەوەی هەم چرایەو هەم سۆپا.

کاتێك شەو دادێت، مانگ وەك مۆمێك لەنور خۆی دەردەخات و ملیارەها ئەستێرەی مرواری ئاسا لە ئاسماندا دەدرەوشێتەوە.

ئاسمان شینە، شینێکی وەها کە چاوەکانمان ماندوو ناکات، بگرە تەماشاکردنی هەستێکی خۆش دەخاتە ناخمانەوە، دەریا پڕ لە ماسییە هەمە جۆرەکانیش هەمان ڕەنگیان هەیە.

ئەو خاکەی لەژێر پێماندایە وەك کارگەیەك هەڵدەسوڕێت و لەسەر پەلی درەختەکانەوە گێلاسی شیرین، شەکرە سێو و سەدەها جۆری دیکەی میوەکان پێشکەش دەکات...

لەبەر خاتری ئەوەی بڕێك شیری شیرین و پڕ لە پرۆتین، چێلەکان لە سپێدەی بەیانییەوە تاکو لێلایی ئێوارە لە کێڵگەکاندا دەلەوەڕان.

مێش هەنگە خنجیلانەکان، لەپێناوی دروستکردنی بڕێك هەنگوین هەزارەها جار زیاتر لە پێداویستی خۆی بۆ پێشکەشکردنی بە ئێمە، تەمەنێکی خەرج دەکرد.

ئاشكرایە زۆر گرنگی دەدرا بە ئێمە، لەهەمان كاتدا ئێمەی مرۆڤ لە جێگەیەكی زۆر جیاوازتر لە هەموو گیانلەبەرانی تر بووین.

ئەدی باشە جیاوازیمان چی بوو؟

لەبەر چی هەموو شتێك بەدەوری ئێمەدا دەخولایەوە، دەژیان تاكو خزمەتی ئێمە بكەن.

بۆ خاتری خودا ئێمە كێ بووین؟

چ كارێكمان هەبوو لێرە ؟

ئایا لە كوێوە هاتبووینە ئەم دونیایەوە ؟

ئەوەی ئێمەی هێنابووە ئێرە، لەبەر چی هێنابووینی؟

ئایا لە بەرامبەر ئەم هەموو بەخشش و نیعمەت و چاكەیەدا دەبوو دەستەوسان دانیشین؟

تەنیا بە سەرسامی فیكەمان پێبدایەو پیاسەمان بكردایە، هیچ كاتێكیش دوای خواردنی (تریێ ڕەشە) پرسیارمان دەربارەی باخەوانەكەی نەكردایە ؟

باشە ئەدی ئایا بەبێ وەستان بۆ كوێ دەڕۆیشتین؟

بۆچی لەدوای ماوەیەك ژیان لەسەر توێكڵی زەوی دەبوو بە ناچاری ماڵئاوایی بكەین؟

بەڵێ، ئەمانە پرسیار گەلێکی گەورەو گرنگ بوون. دەبوو وەڵامەکانیان چنگ بخەین.

## مامۆستایانی هەڵبژاردە

هەریەك لە ئێمە هاوشێوەی باڵندەیەك بووین لەناو دارستانی چڕی پرسیارەکاندا. ئای لە گەورەیی دارستانەکەو گچکەیی ئێمە!

وەلێ لەنێو ئەم دارستانەدا تەنانەت مێروولەکانیش ڕێبەریان هەبوو. بۆ وێنە شاژنی هەنگەکان، پێشەنگی پۆلە مەلەکان، سەرکردەی گورگە دڕندەکان.

ئایا دەگونجا تەنیا ئێمەی مرۆڤ بە بێکەس بمێنینەوە!

ئایا ئەو کەسەی ئێمەی ناردبووە ئەم دونیا قەشەنگە، ئەو کەسەی بەم جوانیە بەدیهێناوین، ئەو خودایەی بەجوانترین شێوە ڕۆزیمان دەداتێ، دەکرا بەبێ سەرپەرشتی و ڕێبەر بەجێمان بهێڵێت؟

بێگومان نەخێر!

خواوەند لەنێوانماندا نێردراوانی هەڵبژارد.

لەبری هەموومان بەناوی هەموومانەوە لەگەڵ ئەوان دووا.

هەر پرسیارێك لای ئێمە گەڵاڵە بووبێت، بەدیهێنەر وەڵامەکەی فێری نوێنەرەکان کرد.

بۆچی ئەم گەردوونەی بەدیهێنا...ئەم مانگە، ئەو خۆرە، ئەو ئەستێرانەو ئاسمانی شین، هەموو شتێکی دیکەی زەوی ئاسمانەکان.. باڵندەکان، ماسییەکان، شێرەکان، پڵنگەکان، مێش هەنگەکان، مێروولەکان..هەروەها مرۆڤەکانی بۆچی بەدیهێنا؟ وەڵامی هەموو ئەمانەی ڕاسپاردەی نێردراوەکان کرد.

هۆکاری ناردنمان بۆ سەر زەوی...

ئایا لێرەوە بۆ کوێ دەڕۆین...

هەروەها پێویستە لێرە بەچ جۆرێك بژین، چ کارێك ئەنجام بدەین و لە چ کارێك دوورەپەرێز ببین...

ئیدی ئەو نێردراوانەی کە هەر لەنێو خۆماندا هەڵبژێرابوون وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە فێربوون و ئێمەشیان فێرکرد.

ئێمە بەو مامۆستا هەڵبژاردانە دەڵێین" پێغەمبەر".

ئەوان بریتین لە هەڵبژێردراوانی پەروەردگار لەنێو خودی خۆمانەوە.

بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، خودای گەورە گەلێك نێردراوی هەڵبژاردووە. ئەوان لەڕێگەی وتەو کرداری جوانی خۆیان، بەیانکردنی ئەو ئایەت و کتێبە پیرۆزانەی بەسروش بۆیان هاتبوو، مرۆڤیان بۆ جوانییەکان بانگهێشت دەکرد.

زۆربەیان گوێیان لێ ڕاگیراو بەقسەیان کرا، هەندێکیشیان پشتیان تێکرا.

ئەو مامۆستایانە لە پێناوی بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانیان، شانیان دایە بەر هەر جۆرە نەهامەتییەك توشیان دەبوو.

زۆربەیان ئەشکەنجە دەدران. زۆرێکیان دەربەدەرکران. لەنێویشیاندا ژمارەیەکیان لەلایەن گەلەکەیانەوە خوێنیان ڕژاو کوژران (شەهید کران).

پاش تەواوبوونی ئەرکی هەریەکەیان و ماڵئاوایی لەدونیا، پەروەردگار پێغەمبەری نوێی دەنارد.

ئادەم پێغەمبەر، ئیدریس پێغەمبەر، نوح پێغەمبەر، هود پێغەمبەر، صالح پێغەمبەر، ئیبراهیم پێغەمبەر، لووط پێغەمبەر، ئیسماعیل پێغەمبەر، ئیسحاق پێغەمبەر، یەعقوب پێغەمبەر، یوسف پێغەمبەر، ئەیوب پێغەمبەر، شوعەیب پێغەمبەر، موسا پێغەمبەر، هارون پێغەمبەر، داود پێغەمبەر، سولەیمان پێغەمبەر، یونس پێغەمبەر، یەحیا پێغەمبەر، عیسا پێغەمبەر، (دروودی خودا لەسەر هەموویان بێت)... ئەمانە ژمارەیەکن لە هەڵبژێراوانی نێوانمان.

ئەوان بەندەگەلێکی چەند بەرزو پیرۆز بوون!

مامۆستا گەلێکی چەند سەربەخێر بوون بۆ مرۆڤایەتی.



چەندین سەدە هات و تێپەڕی، خواوەند چەندین پێغەمبەری دیکەی نارد، ئەمە بەردەوام بوو تاکو هاتنی کۆتا پێغەمبەر حەزرەتی موحەممەد موستەفا (دروودی خوای لەسەر بێت).

ئەو پەیامبەری کۆتابوو کە بنێردرێت بۆ مرۆڤایەتی!

# پێغەمبەرمانﷺ بۆچی لە شاری مەککە لەدایك بوو، لە شوێنێکی دیکە نەبوو؟



پتر لە پێنج سەدە تێپەڕی بوو بەسەر هاتنی پێغەمبەر (عیسا) (سەلامی خوای لێبێت) کات وەکو گەردەلوولێك هەڵیکردو زیاتر لە هەر شتێکی دیکە، زیهنیەکانی بە چینێکی ئەستوری لم داپۆشی.

ئای، مرۆڤەکان چەندە شتیان بیرچووبووەوە !

پێغەمبەر عیسا و پێغەمبەرانی پێش ئەو هەر ڕاستیەکیان ڕوون کردبێتەوە، هەر پەیامێکیان گەیاندبێت، هەر وانەیەکیان فێری مەردوم کردبێت، داپۆشرابوو بەو چینە لمینە.

هیچ کەس لەبیری ئەوەدا نەبوو، ئایا بۆچی ئەم گەردوونە دروستکرابوو...

ئەمە لەکاتێکدا گەردوون وەك پەرتووکێکی مەزن بوو...وەك پەرتووکێکی قەشەنگ کە پیت و وشەکانی بریتی بوو لە ئەتۆم و ئەستێرەکان!

وەلێ چیتر کەس لاپەڕە ناوازەکانی چاو لێ نەدەکرد.

ئایا ئەم گوڵانە بۆچی هێندە جوان بوون؟

ئایا ئەم میوانە بۆچی هێندە بەتام بوون؟

ئایا باڵی ئەم پەپولانە بۆچی هێندە نەخشین بوون؟

ئایا بۆچی ئەو شەوگارەی وەك پەردەیەکی تۆخ ڕۆژگار دادەپۆشێت، بە ئەستێرە دەم بەخەندەکان ڕازابووەوە؟

ئاوە بە خوڕەکان چیان دەوت؟ ئەی دەنگی ڕەشەبا؟ ئەی خوایە گیان، کێ هۆکاری ناڵەی بیابانی بۆ ڕوون کردینایەتەوە؟

بەڵێ، جیهان پێویستی بە مامۆستایەکی نوێ بوو.

مرۆڤ، لەگەڵ زۆر شتی دیکەدا مرۆڤایەتیەکەیشی لەیاد چووبووەوە.

بیرچونەکەیان کتومت وەك چاڵێك وابوو کە قوڵیەکەی بە ئەندازەی تاریکیەکەی و تاریکیەکەی بە ئەندازەی قوڵاییەکەی بێت.

ئەوەشی یەکەمجار کەوتە ناو ئەم چاڵاوە بریتی بوو لە ویژدان، دادپەروەری، ڕاستگۆیی، سۆزو میهرەبانی...

وەك (عاکیفی)[1] هۆنەر دەڵێت:

لە دڕندەییدا مرۆ گورگەکانی تێپەڕاند

بێ کەڵبە بووایە هەرکەس، براکانی دەیانخوارد!

منداڵانی بێباوك دەگریان، بێنەوایان چاو بە ئەسرین، دایکە جەرگ سوتاو ناڵەی دەگەیشتە ئاسمان، بەندەکان فرمێسکی خوێنینیان دەڕشت، وشترەکان لە ژێر باری گرانی خاوەنەکانیاندا هەنسکیان دەدا...

جیهان ڕەنگی هەتیو خانەیەکی گەورەو گرتووخانەیەکی سامناکی گرتبوو!

قامچی دەستی ستەمکاران بەبێ وەستان و وچاندان، شەقەیان لە پشتی ستەمدیدەکان هەڵدەستاند.

ماف و دادپەروەری، وەك دوو فریشتەی ئەهلی هەسارەیەکی دوور دوور بوون و لەدێر زەمانەوە ماڵئاواییان لەزەوی کردبوو...

میهرەبانی و ویژدان لەکوێ بوون؟ خودا دەیزانی چەند سەدەیە نەبینرابوون...

---

[1]- عاکیف: شاعیرێکی بەناوبانگی تورکیایە.

بەڵێ، جیهان پێویستی بە مامۆستایەکی نوێ، پێغەمبەرێکی نوێ بوو.

ئای جیهان چەندە تامەزرۆ و تینوی هاتنی پەیامبەرێك بوو کە هەموو شتێکی لەبیرکراو وەبیر مرۆڤ بێنێتەوە، وەڵامی هەموو پرسیارەکانیان بداتەوە، ماهییەتیان لە هەموو خراپەیەك کە وەك چڵك و پیسی سەرتاپایانی داپۆشیبوو خاوێن بکاتەوە...

## بۆچی مەککە؟

پێشینان وتوویانە: شەوگار چەند تاریك بێت، ڕۆژیش ئەوەندە ڕووناك دەبێت. لە نێوەندی ڕۆژە پڕ نەهامەتیەکانی جیهاندا، لە ساڵی (٥٧١)ی زاینیدا خۆری چاوەڕوانکراو لە کەلی شاری (مەککە)ەوە هەڵهات.

دواین پێغەمبەر چاوی بە دنیا هەڵهێنا.

لەوانەیە پرسیارێك لە زیهندا دروست بێت: باشە بۆچی مەککە؟

پێدەچێت حەز بکەیت بزانیت ئایا بۆچی لە نیوەندی بیابان و لە شارێکی وەك مەککە، کە خەریك بوو ناوی لەنێواندا نەدەما، پێغەمبەریان لەدایك بوو؟

ئەمە چەند هۆکارێکی هەیە، هەندێکیان ئێمە دەیزانین، وە لێ هەندێکی تریان تەنیا خوای گەورە دەیزانێت.

مەککە شارێکی ئاسایی بوو، وەکو هەر شارێکی دیکەی نیوە دورگەی عەرەبی. لە دامێنی زنجیرە چیاکانی (ئەبو قوبەیس)دا هەڵکەوتبوو، گەرم و وشك بوو، زەوییەکەی بێ پیت بۆ کشتوکاڵ، لایەنێکی ئەوتۆی نەبوو سەرنجی خەڵکی ڕابکێشێت بە لای خۆیدا.

بەڵام تایبەتمەندییەکی هەبوو لە هەموو شارەکانی تری جیهانی جیادەکردەوە، ئەویش (کەعبەی پیرۆز)بوو!

## دایکی شارەکان

کەعبە، یەکەم مزگەوتی خودا لەسەر زەوی لە شاری مەککە بنیات نرا بوو. هەر بۆیە مەککە بە شاری شارەکان دادەنرێت. خودا لە قورئاندا بەم جۆرە باسی مەککە دەکات:

ئەم قورئانەیش کە ناردوومەتە خوار بۆت کتێبێکی پیرۆزەو باوەڕی بەو کتێبانە هەیە کە لە پێش خۆیەوە هاتوونەتە خوار بۆ پێغەمبەران، بۆیە ناردوومانە تا ئەهلی مەککەی پێ بترسێنی لە عەزابی خودا. ئەو مەککەی کە دایکانەی دێهاتەکانەو هەموو دێن بۆ زیارەتی ماڵی خودا لەوێ. هەروەها ئەوانەیش بترسێنی

کە لە دەوراندەوری مەککە دائەنیشن. ئەوانەی کە ئیمانیان هەیە بە ڕۆژی دوایی باوەڕیان هەیە بەو قورئانەو هەمیشە ئاگاداری نوێژەکانیانن و نایانفەوتێنن. )) الأنعام:٩٢.



ئەو کەعبەیەی لەسەر دەستی یەکەم مرۆڤ و یەکەم پێغەمبەر حەزرەتی (ئادەم) دروستکرابوو، بە تێپەڕبوونی کات کۆن بوو بوو، داڕووخا بوو. بەڵام پەروەردگار فەرمانی بە ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) کرد بۆ نۆژەن کردنەوەو سەرلەنوێ بنیادنانەوەی کەعبەی پیرۆز.

چەند سەدە تێپەڕی.

ئەو کەعبەیەی کە ئیبراهیم پێغەمبەر سەرلەنوێ بنیادی نایەوە، لەبەر دژایەتی کردنی بتەکان فڕێ درایە نێو ئاگرەوە، ئەو کەعبەیەی ئەو و بەناوی ئەوەوە لەسەر زەوی بنیادنرابوو، واتە (بیت الله)، واتە (ماڵی خودا) چیتر بوو بوو بە (ماڵی بتەکان)!



لەبەرئەوەی خەڵکی شاری مەککە شان بەشانی خووە نابەجێکانیان، دەستیان دابووە پەرستنی بتەکان.

دەیانزانی خودای تاقانە هەیە، وەلێ شان بەشانی سەدەها بتیان لە دارو تەختە و گڵ و قوڕ دروست دەکردو پەرستشیان بۆ ئەنجام دەدا.

بۆ بەدەستهێنانی هەر پێداویستییەك داوایان لە بتەکان دەکرد لەبری ئەوەی ڕاستەوخۆ داوا لە خودای باڵادەست بکەن!!.

لەکاتی ترسدا لەبری پەروەردگاری ڕزگارکەر، هانایان بۆ بتەکان دەبرد.

هەرکات سەفەریان بکردایە لەئاردو هەویرو حەلوا بتیان دروست دەکردو لەگەڵ خۆیان دەیانبرد، کە برسیشیان دەبوو ئەو بتەی تاکو چەند ساتێك پێش ئێستا دەیانپەرست، دەیانخوارد.

گوایە بتەکان ئەوانی لەخواوە نزیك دەکردەوە.

ئەمە لەکاتێکدا ئەو کارەی دەیانکرد، تەنیا بریتی بوو لە هاوبەش دانان بۆ خوای تاقانە ئەو مرۆڤانەی کەعبەیان پڕکردبوو لە بتەکان، دڵەکانیشیان لێوان لێو بوو لەبت و هێندەی بیابان وشك و هێندەی بەرد ڕەق بوو.

کچەکان هەر بە زیندوویی لەلایەن باوکیانەوە زیندە بەچاڵ دەکران.

مەی خواردنەوەو قوماربازی بوو بوو بەشێکی سەرەکی لە ژیانی ڕۆژانەیان...

بێ ڕەوشتی وەکو شتێکی زۆر ئاسایی لێهاتبوو لەبەرچاویان...

ئێرە تاریکترین شوێنی شەوەزەنگی نەزانی بوو.

بەڵێ! درەوشاوەترن خۆر کە زەوی لەسەرەتای دروستبوونیەوە بەخۆیەوە دیبووی لەم جێگا تاریکەدا هەڵدێت، پاش هەڵهاتنی بە ماوەیەکی کورتیش بەڕووی چاوی هەموو مرۆڤایەتیدا شەوق دەداتەوە.

## خۆری هەڵهاتووی ئاسمانی شاری مەککە

کەعبەی پیرۆز هەر لەسەردەمی حەزرەتی (ئادەم)ەوە (سەلامی خوای لێ بێت) بووە نیشانگەی پەرستنی خودای تاقانە، ناسینی (الله) وەك خودای تاقانە، داواکردنی پێداویستییەکان تەنیا لە زاتی ئەو، لەکاتی ترسدا پەنابردن بۆ خوداو پاڕانەوە لەدەرگانەی ئەو، لەسەر زەوی.

مادەم گرۆی بەشەر کەعبەی پیرۆزیان پڕکردبوو لەبت، کەوایە گەر بڕیاربێت پرۆسەیەکی پاکژکردنەوە ئەنجام بدرێت دەبێت

لەهەمان کەعبەی پیرۆز واتە لەشاری مەککەوە دەست پێ بکات.

ئالا لە هەر جێیەك بکەوێت دەبێت هەر لەوێوە بلند بکرێتەوە.

مەککە دایکی شارەکان بوو.

مالی خودا (کەعبە)، کەوتبووە ئەوێوە.

کاتێك پێغەمبەرمان موحەمەدﷺ تەمەنی پیرۆزی گەیشتە ٤٠ سال خوای گەورە فریشتەی خۆی حەزرەتی (جوبرەئیل)ی ناردە لای. ئیدی بەم جۆرە ئەرکی پێغەمبەرایەتی دەستی پێ کرد. بەدرێژایی ٢٣ سال ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی بۆ دابەزی.

پێغەمبەری نازدارمانﷺ بەیارمەتی خودای بالادەست لەماوەی ئەو (٢٣) سالەدا، بووە ئەنجامدەری کۆمەلە کارێکی مەزن کە هەرگیز مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەیدیبوو.

کەعبەی پیرۆز لەبتەکان پاك کرایەوە. وەك هەمان ڕۆژی بنیادنانی لەلایەن حەزرەتی (ئیبراهیم)ەوە پاکژبووەوەو بووە مالی خودا لەسەر ڕووی زەوی.

لەو دلە بەرد ئاسایانەوە تەنیا بە نیگایەکی پێغەمبەری نازدار، بە وتەیەکی ئەو، بەدەست لێدانێکی ئەو وەك کانیاو دەتەقین و ئاوی سازگاری ئیمانیان لێ هەلدەقولا.

ئـەو سـینە چـۆڵ ئاسـاو وشـکەڵانانە گـۆڕان بـە گوڵسـتان و باخچەی ڕازاوە.

بـە تـەنها وتەیـەکی شـیرینی پەیامبـەری مـەزن ئامـادەبوون دەستبەرداری هەموو خوو ڕەوشتی ناپەسەند ببن.

ئەمانە کارگەلێکی ئێجگار مەزن بوون!

ئـەمرۆ خویـەکی بچـووك بـەڵام فـەنای وەك جگەرەکێشـان هەرچەندە هەوڵ و تـەقالای بێشوماری بۆ سـڕکردنی دەدرێـت، وەلێ دەبینیت سەرەڕای ئەوانە سەرکەتوو نییە!

پەیامبـــەری مـــەزن هـــەر بـــەوەوە نەوەســـتا ڕەوشـــتە ناپەسەندەکانیان پێ تەرك بکـات بـەڵکو لـە شـوێنی ئـەوە خـوو ڕەوشتی جوانی فێردەکردن.

ئەو مرۆڤانەی کە بەر لە چەند ساتێك کچەکانیان زیندە بەچاڵ دەکرد، بە کـەمتر بینینیـان لەچاو کوڕانـدا لـەولاوە بوەسـتێت، ئێستا ئیدی گرنگی دەدەن بەوەی جیـاوازی نەکـەن لـە ژمـارەی ماچکردنی منداڵەکانیاندا.

چـونکە پێغەمبەرەکـەی ناویـان فـەرمانی پێکردبـوون: "کـە تەنانەت لە ماچ کردنی منداڵەکانیشیاندا دادپەروەربن".

ئـەو کەسـانەی لەسـەر پشـتی ئـاژەڵی زینـدوو گۆشـتیان لێدەکردەوەو دەیـانخوارد، ئێسـتا ئیـدی پـەنا دەگـرن بـەخوا

لەوەی نەوەك كەمێك باری قورستر لە ئەندازەی خۆی بخەنە سەر پشتی وشترەكانیان.

مەردوم گەلێك هێندە ئالودەی مەی بوون كە گوزەی گەورە گەورەیان هەبوو پڕ لەمەی. هێندە زەبەلاح كە مەلەت تێدا بكردنایە. بەلآم بە بیستنی فەرمانی (قەدەغەبوونی مەی) دەستبەجێ گۆزەو دەفرەكانیان شكاندو هەرچی مەی هەبوو ڕشتیان. یەكەمجاری بوو جیهان ببێتە بینەری وەها ڕووداوێك. لەنێو كوچەو كۆلآنەكاندا لافاوی مەی هەڵسا...

بە زۆر دەركێشانی سامانی خەڵكی لەولاوە بوەستی، كەچی دواتر تەنانەت سامان و موڵكی خۆیانیشیان دەبەخشییە خەڵكی.

برسییەكان تێربوون، بێ جل و بەرگەكان بەرگیان بەبەردا پۆشرا.

پردی برایەتی لەنێوان هەژارو دەوڵەمەند دروستكرا.

هەموو ئەمانە كارگەلێكی مەزن بوون.

ئەو كارانە هەروەك دروستكردنی ئەستێرەكانی ئاسمان بوو لەوردە بەردی كەنار دەریا...

سەردەمانێك مرۆڤەكان بە وێنەی وردە بەردی بێ نرخ لە كوچەو كۆلآنەكانی مەككەو مەدینەدا كەوتبوون، ئێستا ئیدی

بونەتـە هـاوەڵی پێغەمبـەر. وتـەکانی ئـەو، نیگاکـانی ئـەو، بەرکەوتنـەکانی ئـەو بوونـە هـۆی گـۆڕانی ئـەو وردە بەردانـە بـۆ ئەستێرەی گەشی ئاسمان.

ئەو ئەستێرانە هاوەڵی پێغەمبەربوون.

ئێمە بەوان دەڵێین (هاوەڵان)

ئەو خۆرەی لە ئاسمانی دایکی شـارەکاندا (مەککە) هـەڵهات، سەرەتا دەرووونی ئەوانی ڕوونکردەوە.

پاشـانیش ڕووناکییەکـەی بەرچـاوی هـەموو دونیـای ڕوونـاک کردەوە.



## ئایا پێغەمبەرمان بەرلەوەی ببێتە پێغەمبەر چلۆن دەژیا؟ باوەڕی بەچی هەبوو؟ ئایا پەرستشی ئەنجام دەدا؟ ئەگەر ئەنجامی دەدا بۆ کێی ئەنجام دەدا؟



پێغەمبەری خۆشەویستی ئێمە بەر لەوەی ببێتە پێغەمبەریش لەناو گەلەکەیدا پێغەمبەر ئاسا دەژیا. لەسەردەمێکدا کە هەموو جۆرە خراپە، نادادگەری و ستەمێك بەرجەستە بوو، پەیامبەری مەزن ژیانێکی پاك و بێگەردی وێنەی تنۆکی باران هەبوو.

هیچ جۆرە خراپەیەك ئەو زاتەی لەکەدار نەکرد. درمی نەفامی بە هیچ جۆرێك نەگەیشتە ئەو. خەڵکی و چواردەوری نزیك بوو لەناو گۆمی مەی دا مەلە بکەن وەلێ تەنیا دڵۆپێکی نەگەیشتە جستەی پیرۆزی ئەو.

ژیانێکی هێندە پاکژو سەرڕاستی هەبوو کە هەموو کەسێك پەنجەی بۆ ڕادەکێشا.

نازنـــاوی (الأمـــین– ســـپاردەپارێز)یـــان لێنـــابوو. چـــونکە پێغەمبەری نازدار کەسێك بوو لە هـەموو کەسـێك زیـاتر جێگـەی متمانەی خەڵك بوو.

لەسەردەمێکدا کە سەبارەت بە گیانی منداڵە کچەکان متمانـە بـە بـاوکی کیژۆڵـەکان نـەکرێت، وەلێ (موحەمـەدی ئـەمین) بـە هەموو جۆرێك خاوەنی متمانە بوو.

هەموو کەسێك بە (أمین) بانگی دەکرد.

## خودا ئەوی دەپاراست

ڕۆژانـــی کـــاری شـــوانیی پێغەمبـــەری ئازیزمـــان بـــوو. لەگـــەڵ هاوڕێیەکیدا لە جێگایەکی سەرووی شاری مەککە ڕانە مەڕەکـەی مـامی دەلەوەڕانـد. شـەو داهـاتبوو. وەك پیشـەی هەمیشـەیی شەوانە لە شـاری مەککـە ئاهـەنگ و ڕابـواردن سـازدەکرا. چـەند کەسانێك خەڵکییان لە دەوری خۆیان خڕ دەکردەوەو داسـتان و ئەفسانەی کۆنیان بـۆ دەگێڕانـەوە. پێغەمبـەرﷺ بـە هاوڕێکـەی وت: "تۆ ئاگایەکت لە ڕانەکە بێت من دەچم سەیرێکی ئەو کۆڕی شەوانە دەکەم".

هاوڕێکەشی ئەم داوایەی قبوڵ کرد. پێغەمبەری ئازیزیشمان بەپەلەو ڕاکردن بەرەو شار کەوتەڕێ. کە نزیکی مەککە بووەوە دەنگی دەهۆڵ و هاتەو هاواری خەڵکەکەی دەبیست. دیاربوو ئاهەنگ دەگێڕن.

پێغەمبەرمانﷺ بۆ تەماشاکردنی ئاهەنگەکە لە کەنارێکەوە دانیشت. وەلێ هەر کەدانیشت خەوێکی قوڵی لێکەوت و هەر لەوێدا خەوت. هەتا سپێدەی بەیانی و هەڵهاتنی خۆر خەبەری نەبووەوە.

بەهەمان شێوە جارێکی دیکەش بە مەبەستی بەشداری کردن لە ئاهەنگێکدا ڕووی کردە مەیدانێك کە سەدای ئاهەنگ و خۆشی لێوە دەهات. بەڵام دیسان خەوێکی قوڵ و وەنەوزدان زاڵ بوو بەسەریداو خەو بردیەوە.

پاش ئەم دوو ڕووداوە جارێکی دی هەرگیز تێکەڵی گردبوونەوەو نەفامانی (سەردەمی نەفامی) نەکرد. هەرگیز بەشداری نەریتە نابەجێکانی ئەوانی نەدەکرد.

## بۆ بتەکان هەرگیز..!

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لەگەڵ ئەوەی لە خوو ڕەوشتە نابەجێکانی سەردەمی نەفامی دووربوو، بەهەمان شێوە لە بتەکانیشیان دوورەپەرێز بوو.



نە بە منداڵی، نە بە لاوی، نە بە ساڵانی بەر لە بوونە پێغەمبەر هەرگیز ڕێزی لە بتەکان نەگرتووە.

له پێش بتەکاندا هەرگیز نەچەمایەوە، نەیکرد بۆ جارێکیش بێت ڕووی وەرچەخێنێت و تەماشایان بکات. هەرگیز باوەڕی پێیان نەبوو.

له تەمەنی منداڵیدابوو، ڕۆژێکی جەژنی تایبەت بە بتەکان مامی و پوری ویستیان بیبەنە لای بتێکی چڵکن و ناحەز بەناوی (بوانه).

بەرامبەر بەمە پێغەمبەر بڕیاریدا کە نەچێت و وتی: نایەم!

ئەوانیش لێی قەڵس بوون. ناچاریانکرد بەڕازی بوون. وەلێ هەر کە لەبتەکە نزیك بوونەوە پێغەمبەرمان لەچاو ون بوو. گەڕان بەدویدا بەڵام نەیاندۆزیەوە. پاشان زیاتر بۆی گەڕان، لە کۆتایدا لە گۆشەیەکدا دۆزیانەوە دەبینن کە خۆی گرمۆڵە کردوەو لە ترس و بیمدا دەلەرزێت.

پرسیان: "تۆ چیت بەسەرهاتووە؟".

لە وەڵامدا: "پیاوێکی سەرتاپا سپی هاتە نێوان من و بتەکەوەو پێی وتم کە لە بتەکە دوورکەومەوە!".

هەروەك پێشتریش، دوای ئەم ڕووداوە پێغەمبەری نازدارمانﷺ هەرگیز توخنی بتەکان نەکەوت، خۆشی نەویستوون و پەرستشی بۆ نەکردوون.

## (حانیف)یەکان

پێش هاتنی ئیسلام لە شاری مەککەدا کۆمەڵە کەسێك هەبوون ڕوویان نەدەدا بە بتەکان، باوەڕیان پێی نەبوون و لەبەردەمیاندا کڕنوشیان نەدەبرد. ئەوان پێیان دەوترا (حانیف)یەکان.



حانیفەکان بە پێچەوانەی بت پەرستەکانەوە باوەڕیان بەخوای تاقانە هەبوو. ئەوان نمایندەی پاشماوەی ئایینی ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) بوون.

گەر چی دەوران شتی لەبیر مرۆڤەکان بردبووەوە (حانیفەکان)، بە گوێرەی ئەوەی بیستبویان و فێربووبوون لە باوباپیرانیانەوە، باوەڕیان بەخودای تاقانە هەبوو.

پەرستنی بتگەلێکی بێگیان و سازکراو لە بەردو دار هەندێك جاریش حەڵوا، ترس و داواکردن لێیان بەڕای حانیفەکان کارێکی نەشیاوو مایەی کەمکردنەوەی ئاستی مرۆڤ بوو.

باوەڕیشیان بەوە هەبوو کە خوا پەیامبەرێکی نوێ بۆ گرۆی بەشەر دەنێرێت و بەتاسەوە چاو لەڕێگەی هاتنی بوون.

بەشێك لەوان بەخاتری ئەوەی لەکەدارنەبن بە چەپەڵیەکانی ئەو سەردەمە، دوورەپەرێزیان گرتبوو و لە خەڵوەتابوون.

هەندێك لە سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن پێغەمبەری نازدارمانﷺ بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام بەو جۆرەی لە حانیفەکانەوە بیستبووی و فێربوو پەرستشی بۆ خودا ئەنجام دەدا. ئەگەر بەو جۆرەیش نەبێت خۆ ژیانی پێغەمبەرمان و ژیانی حانیفەکان هەمان قاڵبی هەبووە. هەروەها لە شاری مەککەدا کەسێك بەدەر لە حانیفەکان باوەڕی بە بتەکان نەبووبێت تەنها پێغەمبەری ئازیزمان بووە.

## چلۆن پەرستشی ئەنجام دەدا؟

پێغەمبەری نازدارﷺ لەماوەی چەند ساڵی پێش ئەرکی پێغەمبەرایەتی تەواو شەیدای تەنیایی و خەڵوەت بوو بوو. هێندە تێکەڵی خەڵکی نەدەبوو. لەیەك لە نزیك چیاکانی مەککەدا ئەشکەوتێکی بۆ خۆی سازکردبوو. ئەم ئەشکەوتە ناوی (ئەشکەوتی حیراء) بوو، ئازیزمان زوو زوو سەردانی ئەوێی دەکرد. لەوێدا ڕووی دەکردە دەرگانەی خوداو تەنیا بیری لە زاتی ئەو دەکردەوە.

پێدەچێت بە وێنەی حانیفەکان عیبادەتی کردبێت یاخود دووریش نیە ئەو زاتەی کە هیچ کاتێك (موحەمەد) تەنیا ناهێڵێتەوە شێوازی عیبادەتکردنی بەسروش خستبێتە دڵیەوە.

دایکمان خەدیجە خاتوون بوخچەیەکی لەخۆراك بۆ دەپێچایەوە، ئەوەی لەگەڵ خۆی دەبردو چەند ڕۆژ لەو ئەشکەوتە ڕووتەن و گەرمەدا لەحزووری خودای خۆیدا دەمایەوە.

ئەم دۆخە بەردەوام بوو تاکو کاتێکی چاوەڕوان نەکراو و وادەی هاتنی سروش لەلایەن فریشتەی ئەمانەت پارێز حەزرەتی (جوبرەئیل)...

((تۆ هیچ بەتەماو هیوای ئەوە نەبووی قورئانت بخرێتە ناو دڵەوەو بخوێنرێتەوە بەسەرتاو لە زوبانی تۆوە بگا بە خەڵك، لوتف و ڕەحمی خوا بوو بۆت هات، کەواتە نەکەی هەرگیز ببی بە پشتیوانی کافران.)) القصص: ٨٦.





## ئایا کێ ئەو ناوەی دا بە پێغەمبەرمانﷺ؟
## ئایا ناوی تری هەیە؟



ڕۆژانـی دووگیـان بـوونی دایکمـان (ئامینـە خـاتوون) بـوو بـە پێغەمبـەری نـازدارەوە، دووگیانیەکـەی زۆر ئاسـایی گـوزەری دەکـرد. زۆربـەی ئـەو ئـازارو ناڕەحەتیانـەی ئـافرەتی دووگیـان دەیچێژێت لـەکاتی سـکپڕیدا، ئـەو نـەیبوو. وەلێ ئـەوەی دایکـی ئازاردەدا ئەوەبوو کە؛ کۆرپە چاوگەشەکەی کە بەم زووانە دێتـە دونیاوە بە هەتیووی لەدایك دەبێـت. چونکە بـاوکی پەیامبـەری مەزن چەند مانگێك پێش لەدایك بـوونی وەفـاتی کردبـوو. چـەند سـاتێکی کـەم مـابوو بـۆ لـەدایك بـوونی چاوەڕوانکراو. (ئامینـە خـاتوون) خـەونێکی بینـی، لەخەونەکەیـدا داوایـان لێکـرد منداڵەکەی ناو بنێت موحەمەد، پێیان وت: "تۆ بە باشترین مرۆڤ دووگیانی.. کاتێك ئەو هاتە دونیاوە ناوی بنێ (موحەمەد)".

ئەو کەسە ئاسمانەکان و زەوی پێکڕا چاوەڕوانی بوون دواجار چاوی بەدونیا هەڵهێنا. پێغەمبەری ئازیزﷺ بەهاتنی شەرەفی بەخشییە جیهان.

ئامینە خاتوون خەونەکەی بۆ باپیری منداڵەکەی (عبدالمطلب) گێڕایەوە. باپیری دڵشادو خۆشحاڵ بوو، حەوت ڕۆژ پاش لەدایك بوونی، کوڕەزای پیرۆزی لەئامێز گرت و بردی بۆ (کەعبە). لەوێ زۆر نزای کرد. قوربانی کردو گۆشتەکەی بەسەر کەسانی کەم دەرامەتدا دابەش کرد. سێ جار خواردنی دایە خەڵکی مەککە.

لەیەکێك لە میوانداریەکاندا پیاوماقوڵانی مەککە بە (عبدالمطلب)یان وت:" ئەی عبدالمطلب بۆ ئەم کوڕەزایەت ئێمەت بانگهێشت کردووە بۆ لەدایك بوونەکەیو ئاهەنگ دەگێڕیت، چ ناوێکت لێناوە؟".

عبدالمطلب وەڵامی دانەوە:

"ناوم ناوە موحەمەد".

ئەم ناوە لەناو گەلەکەیاندا هێندە بەکارنەدەهێنرا.

لەبەرئەوەی پێشتر زۆر ئەم ناوەیان نەبیستبوو، بۆیە (عبدالمطلب)یان ڕووبەڕووی پرسیارێکی ڕەخنە ئامێز کردەوە:

"ئەدی بۆچی لەبری ئەم ناوە، ناوی کەسێکی نێو خانەوادەکەت یاخود یەکێك لە باپیرانت لێ نەنا؟".

باپیرەی دڵخۆش بەم جۆرە وەڵامی دانەوە:

"دەمەوێت لەئاسماندا خوداو لەزەویشدا مرۆڤ پێیدا هەڵبدەن (مەدحی بکەن)".

وشەی (موحەمەد) واتە؛ کەسێك کە شیاوی مەدح و پیاهەڵدان بێت.

## ناوە پیرۆزەکانی پێغەمبەرﷺ

پێغەمبەری ئازیزمان خاوەنی چەند ناوێکە، هەندێك لەو ناوانە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراون، هەندێکی دیکەشیان بەهۆی تایبەتمەندییە ناوازەکانییەوە پێی دراوە.

ئێستاش پێم باشە وەك نموونە چەند ناوێکیان بە واتاکەیانەوە پێکەوە بخوێنین:

"أحمد" ئەو کەسەی سوپاسی خودا (حمد) دەکات!

"طاهر" پاك و خاوێن.

"طيب" خاوێن و جوان.

"رسول" نێردراوی خودا.

"عبدالله" بەندەی خودا.

"ناصر" یارمەتیدەر.



"بشير" مژدەدەر.

"سيراج" نور پەرشێنەر.

"أمين" ئاسايش دەر.

"بشرى" بەڵێندەری ڕاهاتوو.

"ذكر الله" وەبيرهێنی خودا.

"أُمي" نەخوێندەوار.

"رووف" زۆر بەشەفەقە.

"مصطفى" هەڵبژێراو.

"ناصح" ئامۆژگاريكەر.

"شفيق" زۆر بەشەفەقە.

"منير" ڕوناككەرەوە.

بەڵێ پێغەمبەری ئازيزمان خاوەنی ئەم ناوانەو چەندين ناوی ديكەی وەك ئەمانەيە. هەريەكێكيشيان لەوی ديكە قەشەنگترە.

لەناخی دڵمانەوە دەڵێين:"بە ئەندازەی ژمارەی ئەستێرەكان (صەلات و سلاو) لەسەر هەر ناوێكی بێت".

# ئایا مانای (صلاّوات) چیە؟ بۆچی کاتێك ناوی پێغەمبەر برا دەبێت صلاّوات بدەین؟



بێگومان لە وتارێکی ئایینیدا ئامادەبوویت، گوێبیستی ئەوە بوویت کە وتارخوێن دوای ئەوەی ناوی پێغەمبەر دێنێت، دەڵێت:"صلی الله علیه وسلم" یاخود "علیه صلاة وسلام".

ئەوە ئیدی پێی دەوترێت (صلاّوات).

هەروەها گوێگرەکانیش بەهەمان شێوە (صلاّوات)دەدەن.

ئەو پەرتووك و نووسراوانەی باسی پێغەمبەری نازدارمان دەکەن، لە تەنیشتی ناوەکەوە دەنووسرێت (درودی خوای لەسەر بێت) یاخود ﷺ تاکو بیری خوێنەری بخاتەوە کە (صلاّوات) بدات.

من کاتێك منداڵ بووم نەمدەزانی واتای (صلاوات) چیە، تەنیا پێم وابوو نیشانەیەکی ڕێزگرتنە لە پێغەمبەر ﷺ. بە وێنەی دەستەواژەکانی وەك "زۆر بەڕێز"، "ڕێزدار"، "مەزن"، "پایەدار".... هتد.

وەڵێ لەپاشان فێربووم کە (صلاوات) گەلێك واتای جیاوازتری هەیە چونکە واتای زۆر قوڵی هەبوو. پێش هەموو شتێك (صلاوات) جۆرێکە لە (دوعا).

(صلاة)، وشەیەکە کە واتای (دوعاو میهرەبانی) تێدا بەدی دەکرێت. (صلاة)یش کۆی (صَلاة)ە. واتە وەك ئەوەی بڵێین؛ "دوعاکان، ڕەحمەت و میهرەبانیەکان".

(صلاوات)دان دوای هێنانی ناوی پێغەمبەر واتای ئەوەیە کە لای پەروەردگارمان نزا دەکەین و لە خەزێنەی بێسنووری میهرەبانی ئەوەوە داوای میهرەبانی بۆ پێغەمبەرەکەمان دەکەین.

دەڵێین:"ئەی پەروەردگار هەمیشە سۆزو میهرەبانی و بەرەکەتی خۆت بڕژێنە بەسەر پێغەمبەرماندا".

ئەو پێغەمبەری ئێمەیە.

ڕووناکی چاوو ناخمانە.

ئەو چاكەیەی ئەو لەگەڵ ئێمەی كردووە، لەگەڵ هیچ كەس نەكراوە. تۆش بەسۆزو میهرەبانی خۆت ئەو دابپۆشە!

ئێمە توانای ئەوەمان نیە دیارییەكی شیاو پێشكەشی ئەو بكەین. پەروەردگار خۆت پێی ببەخشە!

بەڵێ، (صلاوات) نزایەكی لەم جۆرەیە.

## ئایا بۆچی (صلاوات)دان هێندە گرنگە؟

كۆمەڵێك وشەو دەستەواژە هەن پێویستە مرۆڤ تەماشای فەرهەنگێك بكات یاخود لەكەسێكی شارەزا بپرسێت بۆ زانینی واتاكانیان. چونكە مرۆڤ شتەكانی بیردەچێتەوە...(وەفا) یەكێكە لەو وشانە.

ئەمڕۆ بیرم لە وشەی (وەفا) دەكردەوە، بەڕاست واتای (وەفا) چییە؟

وەڵ نەمتوانی پێناسەیەكی دروستی لە مێشكمدا بۆ ڕێك بخەم. مێشكم خستە لایەكەوەو بەپەلە چوومە لای گەورەترین فەرهەنگی نێو كتێبخانەكەم. تومەس وەفا واتە: بەردەوام بوون لە خۆشەویستی، پەیوەست بوون و ڕاستگۆیی، هەمیشە خۆشویستنی خۆشەویستەكەت، هەمیشە پەیوەست بوون بەكەسی پەیوەستەوە، هەمیشە ڕاستگۆبوون.

وەفا مانای (بەڕاستگۆیی شوێن پێ هەڵگرتنی ئەو کەسەی شوێنی کەوتوین)ی هەبوو.



(صڵاوات)دان لەسەر پێغەمبەر دوای ناوهێنانی پێش هەموو شتێك پێویستیەکی وەفایە بەرامبەر بە ئەو ﷺ...

سەدای هەر صڵاواتێك لە زارمانەوە بەرزدەبێتەوە خۆشەویستی، پەیوەست بوون و ڕاستگۆیمان بۆ ئەو دووپات دەکاتەوە.

درووددان لەسەر گیانی ئەو دوای بیستنی ناوی، یاخود خوێندنەوەی، واتە "ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە تۆمان لەیاد نەچووە!".

"تۆ، ئەو نەهامەتیانەی تۆ لە پێناوی ئێمەدا چەشتت، ئەو ئیسلامەی تۆ بۆت هێناین و ئەو ئیمانەی فێرت کردین، هەرگیز لەیادمان نەچووە. هەرکاتێك ناوی تۆ ببیستین درورد لەسەر گیانی پیرۆزت دەدەین. وابەستەبوونیشمان هەر بە تۆوەیە!
هەرکاتێك ناوی پیرۆزت دەبیستین، خۆشەویستی تۆمان وەبیردێتەوە و بە وتنی صلاواتیش خۆشەویستییەکە دەچەسپێنین."
ماوەی ئەو چەند سەدەیەی بە وێنەی چیای سەخت کەوتووەتە نێوانمان، بە پشتی دەستمان پاڵی پێوە دەنێین و لەناوی دەبەین..
زارمان هەردەم درورد لەسەر گیانی پیرۆزت دەدا.
تۆمان زیاتر لە هەر کەسێك خۆشدەوێت!

## ئەریٚ باشە پێغەمبەر صلاواتدانی ئێمەی پێدەگات و دەیبیستێت؟

لەهەر جێگەیەکدا بین کاتێك صلاوات دەدەیت بێگومان بە پێغەمبەری ئازیزمان دەگەیەنرێت. ئەمە لەگەڵ ناوی ئەو کەسەی کە صلاواتی داوە..

پەیامبەری نازدار لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا دەفەرمووێت:

"صلّاوات و سەلامم لەسەر بدەن. ئێوە لە هەر کوێیەك بن صەڵات و سەلامەکەتان دەگاتە من".



ئەمەش یەکێکە لە لایەنە باش و سوودبەخشەکانی دروودان.

ئێستا بیربکەرەوە! تۆ صلّاوات و سەلامت داوە لەسەر پێغەمبەری ئازیز، بە ئیزنی خودا یەکبینە پێی دەگات. ئەویش صلّاواتی تۆ قبوولْ دەکات. بەم جۆرەش تۆو پێغەمبەری خودا سەلامتان لەیەکتر کردووە.

ئێستا دەڵێی چی! وەرە با پێکەوە صلّاوات بدەین:

"اللهم صَلِ على سَيدنا محمد وعلى آلهِ وأصحابهِ أجمَعين".

"پەروەردگارا! درودو میهرەبانی خۆت برژێنە بەسەر گەورەمان حەزرەتی موحەمەد وگشت ئەندامانی خێزانەکەی و یارو یاوەرانیدا".

## بۆچی پێغەمبەرمانﷺ خوێندەواری نەبوو؟



یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی پەیامبەری ئیسلام (أُمّي) بوونی بوو. ئایا دەزانیت (أُمّي) واتای چیە؟

ڕاوەستە، بەرلەوەی مانای (أُمّي)یت بۆ ڕوون بکەمەوە بەسەرهاتێکی خۆمت بۆ باس بکەم:

لەکاتی سەربازیمدا ڕۆژێکیان فەرماندە فەرمانیدا هەموو سەربازەکان لە شوێنێکدا گرد ببنەوە. ئێمەش کۆبوینەوەو پۆل پۆل ڕاوەستاین.

فەرماندە چووە شوێنێکی بڵند پرسی:

"لەنێوان ئێوەدا کەسی نەفام هەیە؟ ئەگەر هەیە با هەر ئێستا هەنگاوێ: بێتە پێشەوە!"

بۆ هاوڕێکانم نازانم، وەلێ خودی خۆم زۆر سەرم سوڕما بەوە. ئەوە چ جۆرە پرسیارێك بوو؟

ئەگەر لەنێوانماندا کەسێکی (نەفام) هەبوایە–لەبەرئەوەی نەفام و نەزانە– پێش هەموو شتێك نەیدەزانی خۆی نەفامە. لەبەرئەوەشی نازانێت (نەفام)ە، کەواتە نایەتە پێشەوەو بڵێ (من نەفامم!)!.

ئەدی ئەو مەرجانە چی بوون پێویستبوو هەبن لەکەسێکدا تاکو فەرماندە، ئەو بە (نەفام) هەژمار بکات؟

بەڕای ئەو چ شتێکمان نەزانیبایە (نەفام) دەبووین؟

ئەگەرچی بەرامبەر بەو شتانەی نەماندەزانی چەندین قات زانیاریمان هەبوایە لەبواری تردا، دیسان لە دەستەی (نەفام)ان هەژمار دەکراین؟

فەرماندە ساتێك چاوەڕوانی کرد، پاشان چەند جار پرسیارەکەی دووپات کردەوە، "لەنێوان ئێوەدا کەسی نەفام هەیە؟ ئەگەر هەیە با هەر ئێستا هەنگاوێك بێتە پێشەوە!".

هیچ کەسێك نەچووە پێشەوە.

لەڕاستیدا من خودی خۆمم لەزۆر بابەتدا بە (نەفام) لەقەڵەم دەدا. چون ئێستاش شتێکی وا لە بابەتەکە نەگۆڕاوە! ئێستاش لە گەلێك بابەتدا نەفامێکی ڕووتم!

پێشم وایە هەر بەو جۆرە بەردەوام دەبێت...ئەوانەی کە نایزانم هەردەم ژمارەیان زیاتر دەبێت لەوانەی دەیانزانم.

لەبەر خۆمەوە وتم: "گوایە پێویست نیە هەر ئێستا من هەنگاوێك بچمە پێشەوە! خۆ من نەفامی چاکم..

لەسەروبەندی ئەوەدا بووم هاوار بکەم "فەرماندە، من نەفامم"و بچمە پێشەوە، لەپڕ بەدەنگی بەرزی فەرماندە لەشوێنی خۆمدا چەقیم.

"واتە هیچ نەفامێك لەناو ئێوەدا نیە؟ هەمووتان خوێندن و نووسین دەزانن؟ ئەدی نەخوێندەوارتان تێدا نیە؟

ئاااای! کەواتە ئەو نەفامەی کاتژمێرێکە فەرماندە باسی دەکات و داوا دەکات بێنە دەرەوە، مەبەستی نەخوێندەوار واتە (أُمّي)ە.

باشە، بەڵام (أُمّي) شتێکەو نەفام شتێکی دیکەیە گیانەکەم!

هەروەك چۆن نەخوێندەواری کەسێك نیشانەی نەفامی کەسەکە نیە، هەرواش خوێندەواری کەسێك نیشانەی زانایی کەسەکە نیە.

بۆ نموونە فەرماندەکە لەگەڵ ئەوەی (أُمّي) نەبوو، وەلێ سەبارەت بە مانای (نەفام) بە نەفام و نەزان دادەنرێت.

(أُمّي) واتە کەسێك نەخرابێتە بەر خوێندن، نەبووبێتە قوتابی هیچ کەس و نووسین و خوێندنەوەش نەزانێت.

(أُمّي)یەتی پێغەمبەری نازداریشمانﷺ لەم جۆرە بوو.

ئێستا با بێینەوە بۆ لای پرسیارەکەت:

باشە بۆچی پێغەمبەرمانﷺ (ئومی) بوو؟

بۆچی خوێندەواری نەبوو؟

ئەگەر خوێندەواری هەبایە باشتر نەدەبوو؟

## أمي

بەر لە بەخشرانی ئەرکی پەیامبەری بە پێغەمبەری ئازیزمانﷺ، ژمارەی ئەو کەسانەی خوێندەواریان هەبوو لەشاری مەککەدا ١٥–٢٠ کەس دەبوون. لەبەرئەوە خوێندنەوەو نووسین جیاکارێکی دیاربوو بۆ ئەو سەردەمە.

پێغەمبەرمانﷺ خاوەنی وەها تایبەتمەندییەك نەبوو. هەموو کەسێك لای ئاشکرابوو کە ئەو نەخوێندەوارە.

هەر بۆیە دوای هاتنی (نیگا) بۆ پێغەمبەر و خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان، بێباوەڕەکان هەموو جۆرە ڕێگەیەکیان بەکاردەهێنا بۆ بەدرۆخستنەوەی.



حاشا ! پێیان دەوت"درۆزن" سەد هەزار جار حاشا ! پێیان دەوت"سیحرباز" ملیۆنێك جار حاشا ! پێیان دەوت "شێت"...

گەلێك بوختانی جۆراوجۆریان بۆ هەڵدەبەست وەلێ ئەوەندە دڵنیابوون لە نەخوێندەواریەكەی، هەرگیز نەیاندەتوانی بڵێین:"كتێبی مەسیحی و جولەكەكانی خوێندووەتەوەو فێربووە".

یەكێك لە حیكمەتە گەورەكانی نەخوێندەواری پەیامبەری مەزن، بریتی بوو لە نەهێشتنی هەر جۆرە گومانێك دەرهەق بە قورئانی پیرۆز!

بڕوانە خوای گەورە ئەم حیکمەتە چلۆن باس دەکات لە قورئاندا:

(( تۆ خۆت لەوانە نەبووی کتێب بخوێنیتەوەو بە دەستی ڕاستیشت کتێبت لەدەمی کەسەوە نەنووسیوەتەوە. ئەگەر خوێندەوارو بنووس بوویتایە بتتوانیایە بخوێنیتەوەو بنووسی، بەتاڵوێژەکان بەڵگەیان دەسگیر ئەبوو بۆ گومانیان لەوەدا کە قورئان فەرموودەی خوایە. )) العنکبوت: ٤٨.

پێغەمبەری سەروەرﷺ هەروەك چۆن پێش هاتنی ئیسلام (ئومی) نەخوێندەوار بوو، دوای بوونە پێغەمبەریش بە هەمان شێوە مایەوە. بەدرێژایی ٢٣ ساڵ نیگای بۆ دابەزی.

بەتایبەت پاش کۆچ کردنی بۆ (مەدینە)، نزیکەی (٥٠) نووسەری نیگا پەیدابوون. ئەم هاوەڵانە کە خوێندنەوەو نووسینیان دەزانی هەردەم لەگەڵ پێغەمبەری ئازیزماندا بوون.

هاوەڵانی لە خزمەتیدا ئەو ئایەتانەی حەزرەتی (جوبرەئیل) دەیهێنان دەیاننووسییەوە و لەبەری دەیانگرتەوە.

خوێندنەوەو نووسین لای ئەوان هەر بەوەوە نەوەستا، بەڵکو پێغەمبەرﷺ نامەی پێ دەنووسین بۆ پادشایانی وڵاتانی دیکەو نامە هاتووەکانیشی پێ دەخوێندنەوە.

کاتێك کۆچی کرد بۆ مەدینە لەنێوان خەڵکی مەدینەدا نزیکەی دە کەسێ خوێندەوار هەبوو، بەڵام پاشان ئەم ژمارەیە چەندین جار لە دەوری پێغەمبەردا ﷺ زیادی کرد.

بێگومان لە بارودۆخێکدا چەندین کەس فێری خوێندەواری دەبوون، پێغەمبەریش ﷺ دەیتوانی فێری خوێندەواری ببێت.

بەڵام هەروەك سەرەتا چۆن نەیدەزانی، دواتریش هەر بەو جۆرە فێرنەبوو. بەم جۆرەش دەرگای هەڵبەستنی بوختان و قسەی بێ بنەما بۆ هەمیشە بە داخراوی مایەوە...

## نەخوێندەوار بەڵام پێغەمبەر

خودا هەرگیز بواری نەدا نێردراوەکەی ببێتە قوتابی هیچ مرۆڤێکی دیکە قایل نەبوو بە چۆکدادانی لەبەردەم مرۆڤێکداو فێربوونی خوێندن و نووسین لە کەسێکی دیکەوە.

پێغەمبەرمان نەخوێندەوار بوو وەلێ لەهەمان کاتتدا نێردراوی پەروەردگاری جیهانیان بوو. لەگەڵ ئەوەشدا دواین پێغەمبەر بوو. دواین و بەرزترین پلەی پلیکانەی پێغەمبەرایەتی بوو.

کەس حەدی ئەوەی نەبوو ببێتە مامۆستای ئەو، ئوستادی ئەو، فێری بکات...

هەرچیەك پێویست بووایە خودا بۆ خۆی فێری دەكرد.

كەسێك لەلایەن فریشتەیەكی پایەبەرزی وەك حەزرەتی (جوبرەئیل)ەوە هەواڵ و زانیاری و ئایەتەكانی قورئانی پێ بگات بێگومان پێویستی بە خوێندنەوەی نووسینی مەردوم نیە.

بەڵێ یەكێكی دیكە لە حیكمەتەكانی نەخوێندەواری پێغەمبەرمانﷺ ئەوەبوو...

ئەو نەدەكرا پەرتووكی نووسەرانی سەر زەوی بخوێنێتەوە. خۆ پێویستیشی بە خوێندنەوەی ئەوان نەبوو. وەلێ دوو پەرتووك هەبوو كە هیچ كەسێك نەیدەتوانی هێندەی ئەو بەباشی بیخوێنێتەوە، لێی تێ بگات و بۆ خەڵكیشی ڕوون بكاتەوە.

یەكێك لەو دوو پەرتووكە قورئانی پیرۆز بوو. ئەوی دیكەش پەرتووكی گەردوونە؛ ئەو پەرتووكەی كە هەر لەو ڕۆژەی چاومان بە دونیا هەڵدێنین دەبینە بینەری نەقاشیە ناوازەكانی و ڕستە سەرسوڕهێنەرەكانی نێو لاپەڕەكانی ئەم پەرتووكە...

گەر پێت خۆشە كەمێك درێژە بە بابەتەكە دەدەین...

## بخوێنە!

هێشتا ئەركی پێغەمبەرایەتی نەدرابووە سەروەرمان. ئەو زۆرجار لە خەڵكی و قەرەباڵغی دووردەكەوتەوەو دەكەوتە تێرامانی قوڵ بەتایبەت لەسەر چیای (نور)و چەند كیلۆمەترێك لە دەرەوەی شاری مەككە، لەناو ئەشكەوتێكدا پێیان دەوت ئەشكەوتی (حیراء) چەند شەوو ڕۆژی بەسەر دەبرد.

لە یەكێك لە كۆتایی شەوەكانیدا لە ئەشكەوتی (حیراء)، بەدیهێنەری مەزن فریشتەی نیگا (حەزرەتی جوبرەئیل)ی ناردە لای موحەمەدی ڕاستگۆ.

ئازیزمان بە بینینی حەزرەتی جوبرەئیل ترس چووە جەستەیەوە. نەیدەزانی چ ڕوودەدا.

جوبرەئیل وتی: "بخوێنە!".

سەروەرمان وەڵامی دایەوە: "من خوێنەواریم نیە!".

جوبرەئیل باوەشی كرد بە پێغەمبەردا ﷺ توند گوشی بەخۆیەوە هەتا تەنگە نەفەس بوو بەرینەدا. پاشان دیسان پێی وت: "بخوێنە!".

پێغەمبەر دیسان وەڵامی دایەوە: "خوێنەواریم نیە!".

فریشتە جوبرەئیل دیسانەوە پێغەمبەرمانیﷺ لە ئامێز گرتەوەو گوشی بەخۆیەوەو بۆجاری سێیەم پێی وت: "بخوێنە!".

پێغەمبەرمانﷺ لە وەڵامدا:"من خوێندەواریم نیە!". وەلێ کە بینی حەزرەتی جوبرەئیل بە وەڵامەکە تاسەی نەشکا، بۆیە لێی پرسی:

"پێم بڵێ چی بخوێنم؟".

بەڵێ دوای ئەم پرسیارە حەزرەتی جوبرەئیل دەستی کرد بە خوێندنی ئایەتەکانی سورەتی (العلق) تاکو ئایەتی پێنجەم:

خوای گەورە دەفەرموێت: ((قورئـان بخوێنـە لەگـەڵ هێنـانی ناوی ئەو خوایەی خۆتا کە دروستکردنی هەر دروستکراوێ کاری ئەوە.* ئـەو خوایـەی ئـادەمزادی لـە پارچـەیێ خـوێن دروسـت کـردووە.* بخوێنـــەو خـــوای تـــۆ لـــە هـــەموو بەخشـــندەیێ بەخشـندەترە یـا بەخشـندەی تاقانەیـە.* ئـەو خوایەیـە کـە ئادەمزادی بەهۆی قەڵەمەوە فێرە خوێندن کردووە.*ئـادەمزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە پێشان نەیزانیون.)) العلق: ١-٥.

ئەمانە بریتی بوون لە یەکەمین ئایەتەکانی قورئان کە دابەزینە خوارەوە. هەروەها نیگا بە فەرمانی (بخوێنە) دەستی پـێ کرد لەسەر پێغەمبەر ﷺ.

ئـەی باشـە هـیچ بـیرت لـەوە کردووەتـەوە؟ سـەرەڕای نەخوێندەواری پێغەمبـەر، ئایا بۆچـی خـوای گـەورە لـە یەکـەم ئایەتی قورئاندا فەرمانی (بخوێنە) دەداتە نێردراوەکەی؟

ئایــا پێغەمبــەرێکی نەخوێنــدەوار چ بخوێنێتــەوە و چــلۆن بخوێنێتەوە؟ ئەگەرنا ئەم (خوێندنەوەیە) ئەو جۆرە خوێندنەوە نەبوو کە ئێمە دەیزانین؟

## یەکەم فەرمانی ئیسلام: بخوێنە

لەبیرم دێت کاتێك لە قۆناغی سەرەتاییدا بـووم، لـەیادی ڕۆژی مامۆسـتایاندا سـاڵانە لافیتـەو دروشمـی جیاوازیـان بـە ڕووکـاری پێشەوەی قوتابخانەکەدا هەڵدەواسی.

یەکەمین فەرمانی ئیسلام: بخوێنە.

ئاشکرابوو دینەکەمان فەرمانی خوێندنمان پێ دەدات!

باشە بەڵام چی بخوێنینەوەو چلۆن بخوێنینەوە؟

من ئەوکاتانە زیاتر چیرۆکی (ماسکە سورەکەم) دەخوێندەوە.

ئایا بەو جۆرە فەرمانی دینەکەمم بەجێهێناوە؟

وەڵێ گــەر ئــەو لافیتــەو دروشمانــە بــە دروســتی و تــەواوی بنووسرانایە تەنیا نەنووسرایە"یەکەم فـەرمانی ئـایینی ئیسـلام: بخوێنــە بــەناوی خــوداوە"، بــەڵکو تێبینــی ئەوەشــی لەســەر بنووســرایە کــە خوێندنــەوە چــیرۆك گــەلێکی وەك (ماســکە سورەکە، ئۆتومبێلە فڕیوەکان)، پەیوەندیـەکی ئـەوتۆی نیـە بـە

فـەرمانی خوێنـدنی ئیسـلامەوە، ئـەوکات منـیش کـەم تـا زۆر تێدەگەیشتم لە بابەتەکە...

بـەڵێ، ١٤٠٠ سـاڵ لەمەوبـەر لـەنێو خەڵکێکـدا کـە نـەزانی و نەفامی وەك چینێکی ئەستوور لەپیسی و چڵك ڕووپۆشـی ڕۆح و ویژدانیانی کردبوو...

کەسـانێك کـە کچـەکانیان هـەر بـە زینـدوویی زیندەبەچـاڵ دەکرد...

کەسانێك کە وشترە بەسـتەزمانەکانیان —بـە پاسـاوی ئـەوەی خاوەنـەکانیان مـردوون— لەسـەر گۆڕەکـان دەشـێواندو هـەر بـە زیندوویی بەجێیان دەهێشتن تاکو مرداردەبوونەوە...

کەسانێك کەعبەی پیرۆزیان لێوان لێو کردبـوو لـەو بتانـەی لـە تەختەو قوڕو بەرد دروسـت کردبـوو، دەیانپەرسـتن و کڕنوشـیان بۆ دەبردن...

لـەنێو هـەموو ئـەو کەسـانەدا تـەنیا کەسـێك ڕێچـکەی ئـەوانی نەگرتبوو، کەسێکی نەخوێندەوار داوای لێکرا بە فـەرمانی خـودا بخوێنێت!

"بخوێنـــە بـــە فـــەرمانی خـــودای بەدیهێنـــەر. ئـــەو مرۆڤـــی بەدیهێناوە لە خوێنێکی بەستوو".

بخوێنە چونکە خودا لە هەموو کەس بەخشندەترە.



ئـەو پێغەمبـەرە نەخوێنـدەوارە بیسـت و سـێ سـاڵی ڕەبـەق ئایـەت بـە ئایـەتی قورئـانی پـیرۆزی بـۆ خـەڵکی خوێنـدەوە. ڕوونیکردەوە، فێری کردن و پێی لەبەرکردن.. جارێك و جـارێکی دیکە ڕوونی کردەوە... چـەندین جـار ڕوونـی کـردەوەو چـەندین جار فێری کردن.

ئـــەو پێغەمبـــەرە نەخوێنـــدەوارە بـــەناوی خـــودای تاقانـــەو بەدیهێنەرەوە کتێبی گەردوونی خوێندەوە.

ئەو کتێبە مەزنەی پێکهاتەکـەی بریتـی بـوو لـە ئەسـتێرەکان، چـیاکان، هـەورەکان، دارسـتانە چـڕەکان، بیابانـە بـێ سـەرو بنەکان، درەختەکان، گوڵـەکان، میوەکـان، بـاخ و بێسـتانەکان، دەریـاو زەریـاو ئـاوە بـەخوڕەکان، کانیـاوە سـازگارەکان... باڵنـدەکان، مـێش هەنگـەکان، ئەسـپە ناوچـاو نەخشـینەکان، وشترە ئارامگرەکان، هەزارەها جۆری ماسیەکان،...هتد.

پێغەمبەر لاپەڕەکانی ئەم پەرتووکەی خوێندەوەو "بەناوی خودای بەدیهێنەر"ەوە فێری خوێندنەوەی کردین.

بەبۆنەی ئەو وانانەی لەوەوە فێربووین لە هەر شتێکی نێو ئەم گەردوونە بڕوانین، تێدەگەین کە ئەمە شوێنکاری دەستی خودایە.

بەبۆنەی ئەو وانانەی لەومان وەرگرتبوو، گوڵەکان، ئەستێرەکانی ئاسمان و هەر شتێکی دیکە تەنیا بە بەدیهێنراوی ئەومان دەزانی.

بەهۆی ئەو وانانەی لەوەوە فێربووین هەروەك چلۆن بڕوامان بە بتە لە تەختەو بەرد دروستکراوەکان نەکرد، هەرواش بڕوامان بە ڕێکەوتی کتوکوێر، هەبوونی هێزی سروشت و لەخۆوە دروست بوونی شتەکان نەکرد.

بەپێچەوانەوە بەهۆی ئەو پەندو ئامۆژگاریانەی لەوەوە وەرمانگرتبوو فێربووین کە هەموو بونەوەرێك خودا لەنەبوونەوە دەیهێنێتە بوون.هەر بەو هۆیەشەوە باوەڕمان بە خودا (الله)و تاقانەیی ئەو هێنا...

پێغەمبەری ئازیزمان، تەنیا مامۆستاو ڕێبەرمان بەم جۆرە فێری کردبووین. خودی خۆی بەو جۆرە خوێندبووی و ئێمەشی هەر بەو جۆرە فێری خوێندنەوە کردووە..

## پێغەمبەرمانﷺ بۆچی وەك كەسێكی ئاسایی دەنوست، برسی دەبوو، تینوو دەبوو، ماندوو دەبوو؟



چونكە ئەو یەكێكە لە ئێمە. ئەو نێردراوێكی هەڵبـژێراو بـوو لەنێو مرۆڤەكانەوە بۆ خودی مرۆڤەكان.

ئەگەر پەروەردگار لەبری ناردنی نێردراوێك لەنێو خودی خۆیانەوە فریشتەیەكی بۆ بناردینایە، ئەو فریشتەیە نەیدەتوانی ببێتە مامۆستای ئێمە. ئێمەش بە هەمان شێوە نەماندەتوانی ژیانی ئەو بكەینە نموونەیەك بۆ ژیانی خۆمان. نە ئەو دەیتوانی وەك ئێمە بژی، نە ئێمەش وەك ئەو.

ژیانی ئێمەو ئەوان لەیەكتر ناچن. تاڵی و نەهامەتییەكان، شادومانیەكانمان، ترسەكانمان، ئەو شتانەی پێمان خۆشەو ئەوانەی گەرەكمان نین هەرگیز لەیەك نەدەچوون، گەلێك جیاواز دەبوون.

فریشتەیەك كە هەرگیز برسی نابێت، تینووی نابێت، ماندو نابێت یان كەسێكی وەها چلۆن دەتوانێت پەیامبەرێتی مەردومێك بكات كە برسی دەبێت، تینوو دەبێت، ماندوو دەبێت، سەرماو گەرمای دەبێت؟

شای مێروولەكان لەناو خودی مێرولەكانەوە هەڵدەبژێردرێت.

شاژنی مێش هەنگیش دواجار هەر مێش هەنگێكە.

پێشڕەوی پۆلێك باڵندەی (نەورەس)یش بێگومان نەورەسێكە.

كەواتە پێغەمبەری مرۆڤەكانیش دەبێت لە مرۆڤ خۆی بێت.

ئێستا پێم باشە چەند وانەیەكی پێغەمبەری نازدارمان فێری كردووین تەنیا لەبابەت خواردن و خواردنەوەوە باس بكەم:

كە دادەنیشت لەسەر سفرەی نان خواردن دەیوت "بسم الله".

بەدەستی ڕاست و لەبەردەمی خۆیەوە دەیخوارد.

هیچ كاتێك نەبینراوە لەكاتی خواردندا ڕاكشابێت.

گەدەی پڕ پڕ نەدەكرد، بەر لەوەی بە تەواوی تێر ببێت دەستی هەڵدەگرت.

پاش نان خواردن سوپاسی خوای دەكردو دەستەكانی دەشوشت.

هەردەم كەیفی بە سفرەی قەرەباڵغ دەهات.

میوانداری هاوەڵ و دۆستانی دەکرد.

بەدەم بانگهێشتی خەڵکییەوە دەچوو.

کاتێك دەچووە میوانداریەك و لەڕێگادا کەسانی دیکە یاوەریان دەکرد، مۆڵەتی تایبەتی بۆ وەردەگرتن لە خاوەن ماڵ.

هیچ خواردنێکی پێشکەشکراوی بە ناخۆش ناونەدەبرد.

کاتێك خواردنی دەست نەدەکەوت، ئارامی دەگرت، ڕۆژووی دەگرت، بگرە بەردی دەبەستە زگییەوە.

پێغەمبەری نازداری ئێمە پێغەمبەرێك وەلێ لە هەمان کاتیشدا مرۆڤێك بوو.

گەر پێغەمبەرێکمان هەبوایە هەرگیز برسی نەبوایە یاخود فریشتەیەك پێغەمبەرمان ببوایە، ئایا دەیتوانی بەم شێوە جوانە ببێتە نموونە بۆ مرۆڤایەتی؟

ئایا ئەوکات ئەو وەك ئێمە دەژیا؟ دەیتوانی لە پێداویستییەکانی ئێمە تێبگات؟ یاخود ئێمە دەمانتوانی تەرزی ژیانی خۆمان وەك هی ئەو لێ بکەین؟ ئایا دەمانتوانی ئەو بکەینە نموونەو سەرمەشقی خۆمان؟ ئامۆژگاریەکانیمان وەردەگرت؟ دەمانتوانی ئەوەی دەیکا ئێمەش ئەنجامی بدەین؟

باشە، ئەدی دەمانتوانی هێندە خۆشمان بوێت؟

بۆ وێنە گەر یەکێك لە فریشتەکان وەك پێغەمبەر بهاتایە، ئەوکات ئێمە دەمانتوانی چەند خۆشمان بوێت؟

بەڕای من هەر بە قەد فریشتەی نیگا حەزرەتی (جوبرەئیل) خۆشمان دەویست، پێدەچێت هەندێك زیاتر..

وەلێ بەپێی ئەوەی ئەو فریشتەو ئێمە مرۆڤین، شێوازی خۆشویستنیشمان جیاواز دەبوو.

بۆ نموونە بە ئەندازەی جیاوازی خۆشویستنی پەلکەزێڕینەو خۆشویستنی باوك لەلایەن کەسێکەوە جیاواز دەبوو!

پەیامبەری مەزنی ئێمەش، نێردراوی هەڵبژاردە لە خودی خۆمان...

باوکێك لەوپەڕی ئەرکی باوکایەتی خۆشەویستتر لە دایك...

تاڵە مویەکی قژی بەنرخترە لە گیانمان...

ئەو نە فریشتەیەو نە کەسێکی وەها برسی، تینو، ماندوو نەبێت...ئەو یەکێکە لە ئێمە!

وەلێ لە هەمان کاتدا ئەو پێغەمبەرو ڕێنیشاندەری ئێمەیە.

## ئەو پێغەمبەرێکە

وا هەست دەکەم لە هۆکاری هەڵبژاردنی پێغەمبەرێك لە خودی خۆمـان لەلایـەن پـەروەردگاری جیهانیانـەوە تێگەیشـتی. بـەڵام شتێك هەیە من نیگەران دەکات..

کاتێك پەرتووکگەلێکی نووسراو سەبارەت بـە ژیـانی ئازیزمـان دەخوێنیتـــەوە، چـــەندین لایـــەنی مرۆڤایـــەتی ئـــەو زاتـــەت چاوپێدەکەوێت کە نموونەن بۆ ژیانی ئێمە.

تەماشـــادەکەی، نـــەوەکانی لەسەرشـــان نـــاوەو پیاســـەیان پێدەکات.

سەیردەکەی، لە کۆڵانەکانی مەدینەدا لەگـەڵ منداڵانـدا قسـەی خۆشیان بۆ دەکات و دەیانهێنێتە پێکەنین و دڵخۆشیان دەکات.

تەماشـــا دەکـــەیت دێـــت و (قـــەتران) دەدات لـــە قاچـــەکانی ئاژەڵەکەی.

تەماشا دەکەیت دادەنیشێت و پێڵاوی موبارەکی دەدورێتەوە.

دەبینیـت لـە بـازاڕ لەگـەڵ دەشـتەکییەکدا کـڕین و فرۆشـتن دەکات.

هەموو ئەو یادگاریانە بۆ ئێمە چەشنی خەزێنەیەکن. هەر ساتێکی ژیانی جوانی ئەو وەك چرایەکی ڕۆشنکەرەوەی ژیانی ئێمەیە.

وەلێ ئەگەر تەنیا لەم ڕووە مرۆڤانەیەوە لە پێغەمبەری نازدار بڕوانین ئەوا تووشی هەڵە دەبین.

لەوانەیە لە سوچێکی تاریکی ئاوەزماندا کزیەکی ناوەخت سەرهەڵبدات.

چرپەیەکی بێزارکەر؛ پێدەچێت هەڵە گۆییەك بکات و بڵێ:

"خۆ دەبینیت! ئەویش وەك ئێمە مرۆڤێك بووە. مرۆڤێکی ئاسایی وەك من و تۆ".



پێدەچێت پلەو پایەی ناوازەی ئەو لەبیر بکەین...

دوو نموونه لەم بارەیەوە باس دەکەم لە پەرتووکێکی گەلێك خۆشەویست لەلام: بیر لە درەختێك بکەرەوە، درەختێك پەلەکانی تاکو گەلە ئەستێرەکان بەرز بووبنەوە. وەك هەر درەختێکی دیکە ئەویش تۆوێکی هەیە. گەر تۆ تۆوەکەی بخەیتە چنگتەوەو بتەوێت هەموو تایبەتمەندییەکانی درەختەکە لە جوانیەکانی، پەلەکانی، میوەکانی و...هتد، پێکڕا ببینیت هەرگیز ناتوانین! چونکە ئەوەی لەدەستایە تەنیا تۆوێکە نەوەك درەختەکە.

گەر بڕوانیتە تۆوەکەو بڵێیت:"ئەمە پارچە تەڵاشێکی ئاساییەو بەس" دیسان دەکەویتە هەڵەوە.

ئەگەر خوازیاری بینینی درەختەکەیت، پێویستە سەر هەڵبڕیت و تەماشایەکی ئەو درەختە مەزنە بکەیت کە پەلەکانی گەیشتۆتە کەشکەشانی فەلەك! تەنیا بەو جۆرە دەتوانیت هەموو بڵندی و ناوازەییەکی ئەو درەختە موعجیزە ئاسایە ببینیت.

ئێستاش بیر لە (تاوس)ێك بکەرەوە!

تاوسێك کە بەڕەنگاڵەی پەڕەکانی کلکی، مێشکی مرۆڤی ژێر دەهەژێنێت...پاشان توێکڵی هێلکەی ئەو تاوسە..

بێگومان ئەگەر بتەوێت بە تەماشاکردنی هێلکەی تاوسەکە هەموو تاوسەکە ببینیت، ئەوا نایبینیت!

ئەوکات دەڵێیت:"لەم هێلکە ئاسایییەدا نە ڕەنگێك بەدیدەکرێت نە جوانیەك!".

بەم جۆرەش ناهەقی بەرامبەر تاوسەکە ئەنجام دەدەیت.

کەوابێت پێویستە سەرهەڵبڕیت سەیری ئەو باڵندە ناوازەیە بکەیت. تەنیا لەو ڕێگەیەوە دەکرێت جوانیەکەی ببینیت..

لایەنە مرۆڤانەکانی حەزرەتی موحەمەدﷺ لە خواردن و خواردنەوە، برسێتی، ماندوێتی، هەستان و دانیشتن لەگەڵ هاوەڵەکانیدا، گەمەکردن لەگەڵ منداڵاندا وەك کەسێکی ئاسایی..وەك تۆوی درەختە مەزنەکەو توێکڵی هێلکەی تاوسە ناوازەکە وایە.

کاتێك لەم لایەنانەوە دەڕوانیت و چرپەیەکی نابەجێ بە گوێچکەتدا هەڵدەدات:"کوانێ ئەو سەروەرەی گەردوون باستان دەکرد؟ کوا گەورەی هەموو پێغەمبەران؟ لەکوێیە ئەو کەسەی پەروەردگار هەموو گەردوونی لەبەر خاتری ئەو بەدیهێنا؟ وەلێ من تەنیا وەك کەسێکی ئاسایی دەیبینم".

لەم کاتەدا دەستبەجێ سەرت بەرزبکەرەوە.لەبیرت بێت هەموو ڕۆژێك ملیارەها مرۆڤ لەسەر زەویدا یادی ئەو دەکەنەوەو صەلات و سەلامی بۆ دەنێرن!

سەرهەڵبڕەو ببینە!

بیهێنەرەوە بیرت کە ئەو ڕێبەرێکە توانیی کۆمەڵە مرۆڤێك لە درندەییەوە–منداڵەکانیان زیندە بەچاڵ دەکرد– بگۆڕێت بۆ کەسانێك کە بوونە مامۆستای گرۆی بەشەر!

سەرهەڵبڕەو بەچاوی ویژدانت ببینە!

بیرت بێت ئەو نێردراوی بەدیهێنەرێکە کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی و هەرچییەك لەنێوانیاندا هەیە لە نەبوونەوە هێناویەتیە بوون!

سەربلند بکەو نیگا بکە!

بیر لەوە بکەرەوە ٢٣ ساڵی ڕەبەق لەڕێگەی فریشتەی نیگا (حەزرەتی جوبرەئیل)ەوە ئایەتەکانی قورئانی بۆ دەهات...

بەڵام بە چەند ڕووداوێکی ئاسایی وەك؛ گەمەکردن لەگەڵ منداڵان، دورینەوەی پێڵاوەکانی خۆی، مامەڵەکردن لە بازاڕدا تێ مەکەوەو فریو مەخۆ!

سەرهەڵبڕەو سەیرکە!

دووباره بێتەوە بیرت کە تەنیا لە شەوێکدا بە فـەرمانی خـوای گەورە نیعمەتی شەوڕەوی (میعراج) لە (مەککە)وە بـۆ (قـودس) و لەوێشـەوە بـۆ ئاسمـان و حـزووری پـەروەردگار-کـە بـە هـیچ کەس و پێغەمبەرێکی دیکە نەبەخشرابوو- بەخشرایە حـەزرەتی موحەمەد ﷺ !

ئیدی ئەو کات دەتوانیت تێبگەیت تۆ لەگەڵ (ئومـەتی) چـڵۆن پێغەمبەرێکی...

# ئایا پێغەمبەرمانﷺ وەك پێغەمبەرانی تر موعجیزەی هەبوو؟



ئەگەرێکی گەورە هەیە هیچ کام لە هاوپۆلەکانم ئەوەیان لەبیر بێت. وەلێ من لەبیرمە...

نزیکەی (٢٥)ساڵ لەمەوبەر لە قۆناغی سەرەتاییدا بووین، ڕۆژێك مامۆستایەکمان وتی:"تەنیا موعجیزەی پێغەمبەرﷺ بریتییە لە قورئان، ئەم وەکو پێغەمبەرانی دیکە موعجیزەی تری نیە!" زۆرباش ئەمەم لەیادە.

زۆر سەیرە هەرگیز ئەم وتانەی مامۆستاکەم بیرناچێتەوە، خۆ ئەویش نەك بە نیەتێکی خراپ وتبێتی بەڵکو لەبەر نەبوونی زانیاری دەربارەی ئەمەی دەربڕی.

چەندین ساڵ لە هەندێ شوێن و کاتی وەهادا ئەم پرسیارانەم بیردەکەوتەوە کە هیچ پەیوەندیان بە بابەتەکەوە نەبوو. بیرم کردەوە، وەلێ سەرم لەم کارە دەرنەدەکرد.

بابەتی "پێغەمبەرانی تر خاوەنی موعجیزەی جۆراوجۆرن، بەڵام حەزرەتی موحەمەدﷺ تەنیا موعجیزەی قورئانی هەیە" لەسەردەمی منداڵیمدا بووبووە خولیای مێشکم.

خودای گەورە هەندێ جار موعجیزەی دەبەخشیە نێردراوانی خۆی.

ئەو ئاگرەی (نەمرود) کە حەزرەتی (ئیبراهیم)ی فڕێدایە ناوی، وەلێ ئاگرەکە نەیسوتاند.

حەزرەتی (یونس) لەناو زگی ماسیەکەدا ژیا.

عەساکەی دەستی حەزرەتی (موسا) واتە ئەو توڵە دارەی پێی بوو، بە بەرچاوی فیرعەونەوە بووە مار.

ئافرێنی بەدەسەڵات ڕووباری (نیل)ی بۆ حەزرەتی موساو شوێنکەوتوان کرد بە دوو بەشەوە.

سفرەکانی میواندارى بۆ حەزرەتی (عیسا) هاتە خوارەوە، پەروەردگار بە دەستی موبارەکی حەزرەتی عیسا زام و برینی نەخۆشی وەك بەڵەك چاك کردەوە، تەنانەت بەدەست لێدانێکی مردووی زیندوو دەکردەوە بە ئیزنی خودا.

کاری پێغەمبەرایەتی کارێکی گەلێك ئەستەم و قورس بوو.

بۆیە خودای مەزن هەندێ جار موعجیزەی لەم جۆرەی بۆ پێغەمبەرانی دێنێتە بوون.

مادەم وایە، ئەی نابێت پێغەمبەری ئازیزیشمان کۆمەڵە موعجیزەیەکی هەبێت؟ بێگومان قورئان گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەرمانەﷺ، بگرە تاکو ئەمڕۆش موعجیزەیەکی مەزن و زیندووە.. (سەبارەت بەم بابەتە هەر لەئێستاوە پرسیار لای خۆت گەڵاڵە بکەیت کارێکی باشە! چونکە پەرتووکی دواترمان بریتی دەبێت لە پەرتووکی "تامەزۆری ناسینی قورئانم!".)

باشە، بەڵام بۆچی پێغەمبەرمانﷺ موعجیزەی دیکەی هەبێت؟

دوای چەند ساڵی دوورودرێژ کاتێك پەرتووکێکم خوێندەوە (باشترە بڵێم مەکتوبێکی درێژم خوێندەوە) بۆم دەرکەوت کە مامۆستا بەڕێزەکەمان سەبارەت بەو بابەتە هەڵەی کردووە، ئەویش لەبەر نەبوونی زانیاری.

بێگومان پێغەمبەرمانﷺ خاوەنی گەلێك موعجیزەی دیکەش بوو بێجگە لە قورئانی پیرۆز. ئافرێنی بەتوانا چەندین کاری دەرئاساو موعجیزەی بۆ پێغەمبەری ئازیزی خۆی -کە وەك ڕەحمەت بۆ جیهانیان نێردرابوو- بەدیهێنابوو.

## موعجیزە چیە؟

دەزانم دەستبەجێ لات وایە چەند نموونەیەکی لە موعجیزەکانی سەروەرمان، ئەوانەی لە سەرچاوەکانی فەرموودە پیرۆزەکاندا هاتوون، باس دەکەین بەڵام بە پێویستی دەزانم بەرلەوە، وەڵامی پرسیاری "موعجیزە چیە؟" بدەینەوە.

ڕەگی وشەی موعجیزە بریتییە لە (عجز). واتە ئەوەی مرۆڤ بێ دەسەڵات و دەستەوسان دەکات.

بەکورتی؛ ئەوەی بێجگە لە پەروەردگار هیچ کەسێك ناتوانێت ئەنجامی بدات پێی دەوترێت موعجیزە.

بەڵێ ڕاستە!

کاتێك لەم ڕوانگەیەوە تەماشا دەکەیت، هەموو شتێك موعجیزەیەکە. بۆ نموونە گرتنی سێوێك لەسەر لقی ڕەق و تەقی درەختێك لەتوانای کەسدا نیە ئەنجامی بدات. تەنیا بەدیهێنەر دەتوانێت ئەوە ئەنجام بدات. لەبەرئەوە سێو موعجیزەیە.

گۆڕینی لقە دارێك بۆ شمشێر چەند موعجیزەو کارێکی دەرئاسا بێت، گۆڕینی پەلی درەختێکیش بۆ شەکرە سێو ئەوەندە موعجیزەیە. چونکە هەردووکیان بۆ مرۆڤ بە هەمان

ئەندازە نەگونجاوە. وەلێ خودا ئەگەر بیەوێت بە (تواناکانی) درەخت دەکات چ بە سێو، چ بە شمشێر...

نموونەی شمشێرەکەم لەیاد نەبوو. خۆ ئەمە یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ.

ئەو جەنگەی بە ڕابەرایەتی پێغەمبەرﷺ لەدژی دوژمنانی خودا و پێغەمبەرەکەی هەڵگیرسا، واتە جەنگی بەدر، لەساتە هەرە سەختەکانیدا بوو.

ژمارەی سوپای ئیسلام لە بەرامبەر بێباوەڕاندا ئێجگار کەم بووە لەنێو ئەم سوپایەی کە ژمارەیان کەم و ورەو قارەمانێتیان بەرزترین بوو لەسەر زەویدا، جەنگاوەرێك بەناوی (عوکاشە) شمشێرەکەی شکا.

لەو نێوەندەشدا گرنگترین کەرەستە بۆ (عوکاشە) شمشێرێك بوو. وەلێ کەسیش شمشێری زیادەی پێ نەبوو.

پێغەمبەری ئازیز کە بینی شمشێرەکەی (عوکاشە) شکاوە، کوتەکێکی داری دا بە دەستیەوە، فەرمانی پێدا: "بڕۆ بەمە بجەنگە!".

عوکاشە کوتەکەکەی وەرگرت و کەوتە وێزەی بێباوەڕان.

بەڵێ لەو ساتەدا موعجیزەیەك ڕوویدا. خودای گەورە دارەکەی دەستی عوکاشەی گۆڕی بە شمشێرێکی تیژو بریقەدار.

(عوکاشه) هەم لەم شەڕەدا، هەم لە شەڕەکانی دیکەدا بە درێژایی تەمەنی لەپێناوی خوادا بەشداری کرد، بەهەمان ئەو شمشێرە موعجیزەدارە جەنگا.



## خودا بەدیهێنەری موعجیزەکانە

ئەگەر سەبارەت بە چۆنێتی گۆڕانی کوتەکە دارێك بۆ شمشێر لێزمەی پرسیار دەبارێتە سەر مێشکت، هیچ خەم مەخۆ. گۆڕنی لقە دارێك بۆ شمشێرێکی تیژ ناچێتە عەقڵی هیچ کەسێکەوە.

لەبەرئەوەی ئەمە موعجیزەیە. برێك لەمەوپێش پێناسەی موعجیزەمان کرد. لە دووبارەکردنەوەیدا، سوودوەردەگرین:

"موعجیزە واتە ئەوەی مرۆڤ لەبەردەمیدا دەستەوسانە! تەنیا خودای گەورە دەتوانێت ئەنجامی بدات"...



گۆڕانی کوتەکێك بۆ شمشێرێکی تیژ ناچێتە عـەقڵی کەسـەوە، وەلێ کاتێـك هەلومـەرجی گۆڕینەکـەی دەسـتەبەر بکرێـت ئـەوا بەلامانەوە کارێکی ئاساییە.

هەروەها تەنها یەك مەرج هەیە بۆ گۆڕینی پارچە دارێك بە شمشێر، ئەویش: "ویستی خودا!".

گەر خودا ویستی لەسەر بێت ئەوا پارچە دارێك دەکرێت ببێتە شمشێر، دەکرێت بشبێتە عەسای موسا..

هەروەك سەرەتا ئاماژەم پێدا؛ ئەمانە بۆ ێمە چەند ئەستەم بێت، گۆڕینی پـەلی ڕەقـی درەخـت بـۆ سـێوو پرتـەقاڵ، تـرێ، ئەوەنـدە ئەسـتەمە. ئـەم میوانـەش بەهـەمان شـێوەی شمشێرەکەی (عوکاشە) موعجیزەن.

پێویسته لەم ڕوانگەیەوە بڕوانینە موعجیزەکان، چ موعجیزەی پێغەمبــەرانی پێشـوتر چ موعجیزەکـانی پێغەمبــەری ئازیزمــان بێت.

هەموو موعجیزەکان–ئەگەر چی هـی پێغەمبـەران بێـت– هـەر خودا بەدییان دەهێنێت! ئەمەت هەرگیز لەیاد نەچێت!...

## موعجیزەکانی پێغەمبەرمانﷺ

خــــودا چـــەند مـــوعجیزەی جیـــاوازی بـــۆ پێغەمبـــەری ســـەروەرمانﷺ بـــەدیهێناوە. گـــەر بمانـــەوێت باســـی هـــەموو موعجیزەکان بکەین کە لەبەرهەمی زانا ئایینیەکان و شارەزایانی ژیـــانی ســـەروەرماندا هـــاتوون ئـــەوا دەبێـــت پەرتووکەکـــەمان قەبارەیەکی زەبەلاحی چەند هەزار لاپەڕە بێت.

لەبەرئـــەوە دەمـــەوێت تـــەنیا بـــە ڕســـتەیەك بـــاس لـــە هـــەر موعجیزەیەك بکەم، ئەویش تەنیا ئەو موعجیزانەی کە کاریگەری بێشوماری هەبووە لەسەر خودی خۆم.

ئەگەر بتەوێت ببیتە خاوەنی زانیـاری زیـاتر، دەتوانیـت پشـت ببەستیت بە بەرهەمی گەلێك نووسەرو بیرمەندی شارەزا.



ڕۆژێـك كابرایـەكی دەشـتـەكی دێتـە لای پێغەمبـەرمانﷺ و مارمێلكەیەكی گەورەش لەتەك خۆیدا دێنێت، دەڵێت:

"ئەگەر ئەم مارمێلكەیە پشتڕاستی پێغەمبەرایەتی تۆ بكاتەوە ئەوا منیش بڕوا بە پێغەمبەرایەتیەكەت دێنم".

پێغەمبەرمانﷺ لە ئاژەڵەكەی پرسی: "من كێم؟".

مارمێلكەكەش هەر لەوێداو بەجۆرێك كە هەموو ئـەو كەسـانەی ئامادەن بیبیستن و لێی تێبگەن هاتەگۆو وەڵامی دایەوە:

"تۆ پێغەمبەری خودایت!".

ڕۆژێکی دیکە دەشتەکییەکی دیکە هاتە لای پێغەمبەری خوداﷺ، وتی:"موعجیزەیەکم نیشان بدە تاکو بڕوا بە پێغەمبەرایەتیەکەت بهێنم!".

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ فەرمانی بە کابرا کرد:

"بڕۆ بەو درەختەی دەیبینیت بڵێ پێغەمبەری خودا بانگت دەکات!".

کابرا چووە لای درەختەکەو فەرمانەکەی ڕاگەیاند:

"ئەی درەخت، پێغەمبەری خودا بانگی تۆ دەکات!".

درەختەکەش دەستبەجێ بە بن و بێخەوە ڕەگەکانی لە زەوی جودا کردەوەو هاتە لای سەرداری مرۆڤایەتی:

"سەلامت لێبێت ئەی پێغەمبەری خودا!".

کاتی سەفەربوو. ئاو لەناو سوپای ئیسلامدا بەرەو تەوابوون دەچوو. هەواڵیان بە پێغەمبەرﷺ دا کە ئاوی تەواویان نیە بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن.

سەروەرمان فەرمانیدا:

"ئەو ئاوەی هەیە کۆی بکەنەوەو بیهێنن!".

پێغەمبەرﷺ دوعای خوێند بەسەر ئاوەکەدا، وەلێ کەس نەیزانی چ دوعایەکی خوێندووە.

پاشان پێی وتن کە دەفرێك بهێنن.

دەفرێکی گەورەیان هێنا.

دەستی پیرۆزی خستە ناو دەفرەکەوەو پەنجەکانی کردەوە، پاشان فەرمانی کرد بە پرژاندنی ئاوەکە بە هێواشی بەسەر دەستیدا بۆ ناو دەفرەکە.

دەستیان کرد بە ڕۆکردنی ئاوەکە بەهێواشی بەسەر دەستی پیرۆزیدا.

ئاو وەك کانی لە پەنجەی سەروەرمانەوە هەڵقوڵی. هەموو هاوەڵانی چواردەوری ئەم ڕووداوەیان بە چاوی خۆیان بینی. دەفرە گەورەکە پڕبوو. تینوەکان ئاویان خواردەوە، ئەوانەی دەیانویست دەستنوێژیان شوشت. ئەوانەی کونەی ئاویان پێ بوو کونەکانیان پر کرد. کاتێك هەموویان پێداویستی خۆیانیان تەواوکرد، پێغەمبەرمانﷺ دەستی دەرهێنا. دەفرەکە هێشتا لێوان لێو بوو لەئاو.

جارێکیان دایکی غوڵامە بچکۆلەکەی پێغەمبەر (ئەنەس) خواردنێکی کەمی ئامادەکردبوو. خواردنەکەی دایە ئەنەس و داوای لێکرد بیبات بۆ نێردراوی خودا.

پێغەمبەری خوداﷺ کە خواردنەکەی بینی بەدەست (ئەنەس)ەوە:

فەرمووی: "فڵان، فڵان، فڵان بانگ بکە! پاشان لە ڕێگادا هەرکەسێکت چاوپێکەوت بانگهێشتی بکە با بێت!".

پێغەمبەری ئازیز دوعای بەرەکەتی کرد بەسەر خواردنەکەمەکەدا. نزیکەی (٣٠٠) سێ سەد کەس هاتن و لە خواردنەکەیان خوارد. بەڵام خواردنەکە هێشتاش کەمی نەکردبوو.

لە جەنگی (ئوحد)دا تیرێك بەر چاوی هاوەڵی پێغەمبەر (قەتادەی کوڕی نوعمان) کەوت. چاوی دەرپەڕییە دەرەوە. پێغەمبەری نازدارﷺ بە دیتنی ئەم دۆخە هات و چاوی بەدەستی پیرۆزی خستەوە شوێنی خۆی و دوعای بەسەردا خوێند.

بەم جۆرە (قەتادەی کوڕی نوعمان) چاك بووەوەو بگرە لە چاوەکەی دیکەی باشتر دەیبینی.

پێغەمبەری ئیسلام هەروەك چۆن هاوشێوەی پێغەمبەرە پێشووەکان تەنیا بۆ قەومەکەی خۆی ڕەوانە نەکرابوو، هەرواش تەنیا پێغەمبەری مرۆڤ نەبوو.

ئەو پێغەمبەری مرۆڤ و، جنۆکەو هەموو بونەوەرانی دیکەی نووسراو لەسەر لاپەڕەکانی پەرتووکی گەردوون بوو.

خودا ئەوی وەك ڕەحمەت بۆ جیهانیان هێنابووە بوون. بۆیە هەموو بونەوەرێك ئەوی دەناسی و پشتڕاستی پێغەمبەریەتیەکەی دەکردەوە.

بەر لەوەیش ببێتە پێغەمبەر، هەورەکان لەسەر سەری سێبەریان دەکرد.

داروبەردی مەککەو چواردەوری بووبوونە پەروانەی دەوری، بە هاتنی سەلامیان لێ دەکرد.

کاتێك کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە، دەرگای ئەو ئەشکەوتەی خۆی تێدا حەشاردابوو بۆ خۆپاراستن لەدەست بێباوەڕان لەلایەن جاڵجاڵۆکەیەکەوە داپۆشرا.

ئەو پایەیەی لەشاری مەدینە هەمیشە پاڵی پێوە دەدا، پاش ئەوەی لێی دوورکەوتەوە، بە بەرچاوی هەموو هاوەڵانەوە بە وێنەی وشترێك هاواری گریان و ناڵەی لێ بەرزبووەوە.

وشترانی شەکەت و ماندوو لەبەردەمیدا چۆکیان داداوەو ناڕەزایی لەباری ناهەمواری خۆیان دەکرد.

کەسانێك بە ئامانجی کوشتنی لێی نزیك دەبوونەوە پڕ بە ژەهرێك توندترو کوشندەتر لە ژەهری مار، بە تەنیا نیگایەك و تەنیا وشەیەك و تەنیا دەستلێدانێکی پێغەمبەری نازدار، ئەو کەسانەی دەکردە عاشقی پێغەمبەرو فیداکاری گیانیان لەڕێگەکەیدا.

هەر هەواڵێك لە زاری پرۆزی بهاتایەتە دەرەوە سەبارەت بە داهاتوو، کوت و مت وەك خۆی دەهاتنە دی.

کاتی وشکەساڵی بێ بارانی، دەستەکانی بەرزدەکردەوە لە دەرگانەی میهرەبانی پەروەردگار دەپاڕایەوە، بەر لەوەی دەستی پیرۆزی داگرێتەوە دەرگاکانی میهرەبانی ئاسمان دەکرانەوەو تنۆکەکانی باران دادەبارینە سەر زەوییە وشك هەڵهاتووەکان و لێوە قڵێشاوەکانیان تەڕ دەکرد.

بەدەست لێدانێکی شیفای ئانی دەبەخشییە برینەکان.

وردە بەردەکان لەناو لەپی پیرۆزیدا هاتنە گۆ.

ئاوی سازگاری وێنەی کانیاو لە پەنجەکانییەوە هەڵدەقوڵی.

هەر گەردیلەیەکی ئەو خۆڵەی بەو دەستە پیرۆزە کرا بە سەرو چاوی بێباوەڕەکاندا شێوەی گولەیەکی وەرگرت و ئامانجی خۆی پێکا.

بە ئاماژەیەکی ئەو دەستە پیرۆزە مانگ کەرت بوو.

بەڵێ ئەو دەستە، دەستی نێردراوی پەروەردگاری جیهانیان بوو.

تەنیا لەبەر دەستی پیرۆزی ئەو زاتە خودا چەندین موعجیزە دێنێتە بوون.

## ئایا پێغەمبەرمانﷺ چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئاژەڵاندا دەکرد؟ ئایا ئاژەڵانی خۆشدەویست؟



خۆشەویستی و شەفەقەی پێغەمبەری ئیسلامﷺ بە چەشنی خۆر، بە هەڵهاتنی تیشکەکەی هەموو کەس و شتێکی ڕووناک و گەرم کردەوە. هیچ بونەوەرێك -جگە لەوانەی پشتیان تێ کردو دوژمنایەتیان کرد- بێبەش نەبوو لەو میهرەبانییە.

وشتر، ئەسپ، بزن، پشیلە، باڵندەکان... هەموو گیانلەبەرێك بێ جیاوازی پشکی خۆی لە خۆشەویستییەکەی پچڕی..

سەردەمانی پێش ئەو، واتە لەسەردەمی نەفامیدا، مرۆڤەکان زۆر بێ ڕەحمانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئاژەڵان دەکرد.

لەسەر پشتی وشترێك ڕووبەڕووی یەكتر بۆ چەندین كاتژمێر دادەنیشن و وتوویژیان دەكرد. ئەوانیان وەك كورسی بەكاردەهێنا، هەرگیز بیریان لەوە نەدەكردەوە كە ئەویش گیاندارەو ماندو دەبێت.

گوێچكەو كلكی ئاژەڵەكانیان دەبڕییەوە؛ ڕووخساری ئاژەڵەكانیان بەئاسنی سوورەوەكراو دیاری دەكرد تاكو لەگەڵ ئاژەڵانی كەسی دیكەدا تێكەڵ نەبێت.

لەڕێگەی دووردا سكی وشترەكانیان كون دەكرد بۆ ئەوەی خوێنی لێ دەربهێنن و بیخۆنەوە. بگرە گۆشتیان لەسەر پشتی وشترەكانیان هەر بە زیندوویی لێ دەكردەوەو دەیانخوارد، پاشان جێگەی برینەكەیان دەدورییەوە.

ئەمانەو چەندین ستەمی هەوشێوەیان دەرهەق بە ئاژەڵان ئەنجام دەدا.

پێغەمبەرمانﷺ بە هاتنی، ئازاردانی ئاژەڵان و بگرە قسەی ناشرین و نەفرەت لێكردنیانی قەدەغە كرد.

زۆرترین ئەسپ و وشتری خۆشدەویست.

فەرمانی كردبوو تاكو زۆر بەباشی ئاگاداری بەخێوكردن و پارێزگاریان بن.

ڕۆژێـك وشـترێكی بەسـتەزمانی چـاوپێكەوت، بـارێكی پـتر لـە تواناى خۆی لێنرابوو. ئاژەڵی هەژار هێندە بارەكەی قورس بـوو نەیدەتوانی لەجێگەی خۆی بەرزبێتەوە.

پێغەمبەرﷺ بەم جۆرە لەگەڵ خاوەنەكەیدا دوا:

"خودا فەرمانتان پێ دەكـات بـەوەی زۆر باشـتر ئاگاتـان لـەم بەستەزمانانە بێت. بە ئەندازەی هێزی خۆیان باریان لێ بنێن!".

مەڕو بزن لـەو ئاژەڵانـە بـوون پێغەمبـەری نـازدارﷺ چـاودێری دەكردن. ئەوانی وەك بەرەكـەت تەماشـا دەكـرد، بـە "ئـاژەڵانی بەهەشت" نازەندی دەكردن.

مـن وەك شـەیدایەكی "پشـیلە" هەمیشـە دەمویسـت بـزانم پێغەمبەری نازدارﷺ سەبارەت بە پشیلە چی دەڵێت؟

تومەس پێغەمبەریشﷺ پشیلەی خۆشویستووە!

ئای گەر بزانیت چەند دڵخۆش بووم بە بیستنی ئەمە!

ڕۆژێكیان دەیویست دەستنوێژ بشـوات، پشـیلەیەكی خـڕپن و جوانكیلـە هـات و دەسـتی كـرد بـە ئـاو خواردنـەوە لـە ئـاوی دەسـتنوێژەكەی. پێغەمبـەری میهرەبـان چـاوەڕێی كـرد تـاكو پشیلەكە تێرئاو بوو، نەیترساند و پاشان دەستنوێژەكەی گرت.



ئەوانەی لەوێ بوون پرسیان:

"ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا ئاوەکە پیس نەبووە؟".

پێغەمبەر لە وەڵامدا:

"نەخێر! پشیلە لە ئەهلی ماڵە، یەکێکە لە ئەندامانی خێزان.
هیچ شتێ: پیس ناکات!".

جارێکیان پێغەمبەری ئازیز چیرۆکی ئەو ئافرەتەی بۆ هاوەڵانی دەگێڕایەوە کە نان و ئاوی بە پشیلەکەی نەداوە تاکو لە برسا مردووە، لەبەر ئەو کارەی ئافرەتەکە تووشی سزای دۆزەخ هاتووە.

جارێکی دیکەش چیرۆکی لێخۆش بوون لە هەموو تاوانەکانی پیاوێك کە لە ڕۆژێکی ئێجگار گەرم و وشکدا تاکێ پێڵاوی خۆی دادەکەنێت و ئاو بە سەگێکی تینوو دەدات...



ڕۆژێکیان لەگەڵ یەکێک لە هاوڕێ چکۆلەکانی کە (ئوسامە) بوو بەم شێوەیە دووا:

"ئەی ئوسامە وریابە دەربارەی ئاژەڵان، ئەگینا لە ڕۆژی دواییدا سکاڵات لێ دەکرێت!".

لە وەڵامی پرسیاری کۆمەڵێك کە "گوایا لە بەرامبەر ئەو چاکانەی بەرامبەر ئاژەڵان دەیکەین پاداشتمان دەست دەکەوێت؟". فەرمووی:

"بەڵێ، پاداشتی ئەو چاکانە وەردەگرن!".

ڕۆژێك لە ڕۆژان چاوی بە وشترێکی ئێجگار لاواز کەوت. لەپڕ ڕووخساری تێکچوو، بەزەیی بە حاڵی ئاژەڵەکەدا هاتەوەو بە

خاوەنەکەی وت:"سەیری حاڵی ئەو بەستەزمانە بکەو لەخوا بترسە!".

پێغەمبەری ئازیزﷺ سەبارەت بە مافی ئاژەڵان هێندە هەستیار بوو، هەر کە هەڵەیەکی دەبینی خێرا ئاگاداری دەکردنەوە.

جارێك بینی دایکمان حەزرەتی (عائیشە)-کە خۆشەویسترین بوو لای- تۆزێك بە ڕەقی لەگەڵ وشترەکەی هەڵسوکەوت دەکات. بۆیە دەستبەجێ بەم جۆرە ئاگاداری کردەوە:

"ئەوەی بەزەیی نەیەتەوە بەوانی تردا، بەزەیی نابینێت!".

سەرورەمانﷺ باڵندەکان، بەتایبەتیش کۆترەکانی زۆر خۆشدەویست. چێژی دەبینی لە باڵەفڕی باڵندەکان. ئامۆژگاری ئەوانەی دەکرد یەك تاك کۆتریان هەبوو بە پەیداکردنی هاودەم و جووت بۆی.

چەند نموونەیەکم دەربارەی خۆشەویستی پێغەمبەرمانﷺ بۆ ئاژەڵان بۆ باس کردی. ئێستاش دەمەوێت کۆتا نموونەت بۆ بگێڕمەوە:

ژمارەیەك لە سوپای ئیسلام بەڕێ کەوتبوون بۆ ڕزگارکردنی شاری مەککە نزیکەی دە هەزار کەس بوو. لەپێش هەمووشیانەوە سەروەرمان پێشڕەوی دەکرد.

لەپڕ لەسەر ڕێگەکەیان سەگێکیان بینی شیری دەدا بە بێچوەکانی، سەگە دایکانەکە بەم دواییانە بێچووی بوو بوو.

پێغەمبەری ئازیزمان دەستبەجێ پاسەوانێکی بۆ دانان. ئەو پاسەوانە تاکو هەموو سوپاکە دێت و تێدەپەڕێت لەوێدا ڕاوەستا. بەم شێوەیەش دایك و بێچووەکانی نەکەوتنە ژێر پێی ئەسپی سوپاکەوەو ژیانیان پارێزراو بوو.

ئەو سوپایەی کە هیچ هۆکارێك نەیدەتوانی بیانگێڕێتەوە، یەك دوو بێچووە سەگ تاکو دڵیان دانەخورپێت، بوونە هۆی ڕێ گۆڕینی ئەو سوپایە.

جیهان لەو کاتەوەی دروست بووە، هەڵسوکەوتێکی هێندە هەستیاری بەرامبەر ئاژەڵان بەخۆیەوە نەدیبوو. لەدوای ئەو ڕۆژەش هەرگیز نایبینێتەوە...



## ئایا پێغەمبەرمانﷺ منداڵانی خۆشدەویست؟



پێغەمبەری ئازیزی ئێمە کەسێك بوو کە تەنانەت ئەسرینی چاوی وشترە ماندوەکانی کوچەو کۆڵانەکانی ناو شاری مەدینەی دەسرییەوە، دەستی دەهێنا بەسەریانداو دڵنەوایی دەکردن. ئایا دەشێت پێغەمبەرێك بەو هەموو میهرەبانییەوە منداڵانی خۆش نەوێت!

لەکۆڵان سەلامی لە منداڵان دەکردو دەستی دەهێنا بەسەریاندا.

منداڵان لە چواردەوری کۆدەبوونەوە، دەستی بۆنخۆشی دلڕفێنتر لە گوڵەباخی بەیانیان-یان ماچ دەکرد. ئەم هەرگیز جیاوازی منداڵی کچی نەدەکردو هەمان هەڵسوکەوتی لەگەڵ کورو کچ دەکرد، ئەمە لەکاتێکدا لەسەردەمی نەفامیدا کچۆڵەکان زیندەبەچاڵ دەکران.

جارێك لەگەڵ منداڵێكی كچدا هاتە مزگەوت، لەكاتێكدا نوێـژی بۆ هاوەڵان كرد كیژۆڵەكە هەر لە كۆشیدا بوو.

جـارێكی دیكـە، زوتـر نوێژەكـەی كۆتـایی پـێ دەهێنێـت لەبەرئەوەی گوێی لە گریانی منداڵێك بوو.

هەمیشە غوڵامە چكۆلەكەی"ئەنەس"ی بە "ئەنـەس گیـان" و "ڕۆڵەكـەم" بـانگ دەكـرد. ئـەوی ئێجگـار خۆشدەویسـت. گـەر بزۆكییەكی بكردایە هەرگیز لێی تـوڕە نـەدەبوو و هەمیشـە لێـی دەبوورا. هەروەها ڕێگەی نەدەدا بەهیچ كەسێك لێی توڕە ببێت.

لەماوەی دە ساڵی ڕەبەقی خزمەتكردنیدا، كەس نەیـدیبوو بـۆ جارێكیش بێـت بـە ئەنـەس بڵێـت:"بۆچـی ئـەو كـارەت نـەكرد" یاخود "بۆچی بەو جۆرەت كردووە؟".

لەگەڵ منداڵاندا شۆخی دەكرد. لەگەڵ ئـەوان گەمـەی دەكـرد، پێشبڕكێی دەكرد، لە ئامێزی دەگرتن و ماچی سەری دەكردن.

هەركات میوەیەكی تـازەی پێشـكەش بكرایـە دەسـتبەجێ بـە چواردەوریدا خولی دەخـواردو لـەدووی منـداڵان دەگـەڕا. چـونكە پێغەمبەری نازدار پێـی بـاش بـوو میـوەی تـازە بـەر لـە هـەموو كەس دەبێت منداڵان نۆشی بكەن.

بـۆ نـەوەکانی –کـە حـەزرەتی حەسـەن و حسـین بـوون و لەجێگەی جگەری بـوون– سـواری پشـتی موبـارەکی دەکـردن و پیاسەی پێ دەکردن.

فەرمانی کردبوو: "ئەوەی منداڵی هەیە با ببێتە منداڵ بۆی".

لە کۆمەڵێك دەشتەکی –کە بانگەشەیان بۆ ئـەوە دەکـرد هـیچ کاتێك ماچی منداڵانیان نەکردووە– بەم جۆرە قەڵس بـوو: "گـەر خـودا سـۆزو بـەزەیی لەدڵـەکانی ئێـوە دەرهێنابێـت مـن چـی بکەم!".

لەدوا کاتژمێرەکانی کۆچکردنیدا بوو لە مەککەوە بۆ مەدینە. دانیشـتوانی مەدینـە پۆلیـان بەسـتبوو بـۆ بـەخێرهێنانی کۆچکەران. پێغەمبەری ئازیزمان کاتێك بە تـەواوی لەشـار نزیـك

بـووەوە كۆمـەڵێك منـداڵ بـەرەو پـیری غاریـان دەدا، ئـەمیش سەلامی لێ کردن.

منداڵەکانیش لە وەڵامدا هاواریان دەکرد:

"تۆمان خۆشدەوێت، تۆمان خۆشدەوێت!".

لەسەر ڕوومەتی پێغەمبەری نازدارمـان –کـە وەك مـانگ و ڕۆژ دەدرەوشایەوە– خەندەو بزەی خۆی نیشان دەدا، وتی:

"منیش ئێوەم خۆشدەوێت!".

وەك وتمـان، پێغەمبـەرێك فرمێسـکی وشـترەکان بسـڕێتەوەو، دەست بهێنێت بەسەریانداو دڵنەواییان بکات، بێگومان منـدالانی گەلێك خۆشدەوێت.

بێگومان منداڵانیش ئەویان خۆشدەوێت.



## ئایا پێغەمبەرمانﷺ شۆخی لەگەڵ هاوەڵانی دەكرد؟



دەزانم بۆچی لەكاتی كردنی ئەم پرسیارەدا هێندە هەست بە شەرمەزاری دەكەیت. تۆ منداڵێكیت هەمیشە حەزدەكەیت شۆخی بۆ هاوڕێكانت بكەیت. وەلێ بەشێك لەو شۆخیانەی دەیانكەیت لەبری پێكەناندنی خەڵك دەیانگرێنێت. ئێستاش پێت خۆشە بزانیت ئایا نێردراوی پەروەردگارﷺ شۆخی بۆ هاوەڵانی دەكرێت؟

سەرەتا دەمەوێت ئەوەت پێ بڵێم كە پەیامبەری مەزنﷺ كەسێكی مڕومۆچ نەبووە.

بە وتەی هاوەڵانی، ئەو لەناو هاوەڵانیدا زۆرترین جار زەردەخەنەی دەکرد. وەلێ هێندە بە ئەسپایی بزەی دەکرد کە هەرگیز ددانی پیرۆزی دەرنەدەکەوت.

سەبارەت بە شۆخی کردنیش، بەڵێ پێغەمبەرﷺ جار جار شۆخی بۆ هاوەڵانی دەکردو دەبووە هۆی پێکەناندنی ئەوان، دڵخۆشکردنیان بە گێڕانەوەی چەند بیرەوەری خۆشی—نەبڕاوە.
ڕۆژێك یەکێك لە هاوەڵان لێی پرسی:
"ئەی پێغەمبەری خودا ئایا تۆش لەگەڵ ئێمەدا شۆخی دەکەیت؟".
پێغەمبەریش ﷺ لە وەڵامدا:
"بەڵێ، وەلێ من هەرگیز قسەیەك ناکەم ڕاست نەبێت!".
بەم شێوەیەش ئەندازی شۆخی کردنی بۆ هاوەڵانی و نەوەکانی داهاتوو دانا.
بەڵێ، هەر بەو شێوەی تەنانەت بێباوەڕەکانیش بەتەواوی بڕوایان بەڕاستی وتەکانی هەبوو، هەرگیز وشەیەك دوور لە ڕاستی لە شۆخییەکانیدا لە زار نەهاتە دەرەوە.
ئێستاش چەند نموونەیەك لە شۆخی و قسە خۆشەکانی ئازیزمانت بۆ باس دەکەم. ئەوکات بۆت دەردەکەوێت کە شۆخی

دەبێت چەند دوور لە درۆ، دوور لە فێڵ، بێ خەوش و بێگومان بێ زیان بێت!

ڕۆژێك کابرایەك هاتە لای پێغەمبەرﷺ و داوای ئاژەڵێکی کرد بۆ خۆی.

پێغەمبەری خۆشەویستﷺ وەڵامی دایەوە:

"وەرە با تۆ سواری بێچووە وشترێکی مێ بکەین!".

کابرای هەژار سەری سوڕما، وتی:"ئەی نێردراوی خودا، من چی بکەم لە بێچووە وشتری مێ، خۆ ئەوە بەکاری من نایەت!".

پێغەمبەری نازداریشﷺ بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە:

"ئەی ئایا هەموو وشترەکان بێچووی وشترێکی مێینە نین؟".

ڕۆژێکی دیکە یەکێك لە هاوەڵە ئافرەتەکان هاتە لای پێغەمبەرﷺ چەند پرسیاری هەبوو ئاراستەی بکات. لەوانەیشە هاتنەکەی تەنیا بۆ بینینی پێغەمبەری نازدار بووبێت!

پێغەمبەرﷺ پرسیارێکی ئاراستە کرد:

"ئایا تۆ خێزانی ئەو پیاوەیت سپیاییەکە لە چاویدایە؟"

ئافرەتەکەش بە سەرسوڕماوی پرسی:

"ئەدی چاوی هەموو کەسێك سپێنەی نیە!".

جارێك ئافرەتێكی پیر هاتەلای پێغەمبەرﷺ وتی:

"ئـــەی پێغەمبـــەری خـــودا دوعـــام بـــۆ بكـــە تـــاكو بچـــمە بەهەشتەوە".

پێغەمبەر لە وەڵامدا فەرمووی:

"ئافرەتانی بەتەمەن ناچنە بەهەشتەوە".

پیرەژنـــی هـــەژار زۆر ســـەری ســـوڕما. نـــازداری وتـــە شـــیرین بەردەوام بوو لە قسەكردن:

"دڵتەنگ مەبە! دڵتەنگ مەبە! مەبەستم ئەوەیە وەك كچێكی گەنج دەچیتە بەهەشتەوە نەوەك بە پیری!".

پێغەمبـــەرﷺ هەنـــدێ ســـنوورو ئەنـــدازی شـــۆخی كردنـــی بـــۆ هـــاوەڵانی دانـــا. ئـــەو ئەنـــدازەو ســـنوورانە تـــا هەتایـــە بـــۆ گـــەلانی موسوڵمانان هەر دەمێنێتەوە بەكارایی.

یەكێك لەو سنوورانە، درۆ نەكردنە ئەگەرچی لـە چوارچێوەی شۆخیشدا بێـت. شـاردنەوەی شمـەكی كەسـێكی دیكـەو كردنـی شۆخی ترسێنەر بەهیچ جۆرێك لای پێغەمبەری ئازیزﷺ پەسـەند نەبوو.

تـــۆ پرســـیارت كـــرد منـــیش ڕوونم كـــردەوە. ئێســـتا ئیـــدی ئومێدەوارم لەمەودوا خۆت ئاگاداری شۆخیەكانت بیت..

# ئایا سوننەتی پێغەمبەرﷺ مانای چیە؟ بۆچی هێندە بۆمان بایەخدارە؟



جاران کە باسی سونەت بۆ منداڵانی گەڕەك دەکرا؛ پێش هەموو شتێك پڵاو گۆشت و ماستاوی ساردیان بەبیردا دەهات، ئەمە لەلایەك لەلایەکی دیکەشەوە سونەتکردنی منداڵان لەلایەن خەتەنەچییەکەی گەڕەکەوە دەهاتەوە پێش چاویان!

سونەتکردن یەکێکە لە سونەتەکان، وەڵێ سونەت تەنیا بریتی نیە لە سونەت کردن!

باشە ئەدی سوننەت چیە؟

"سونەتی پێغەمبەرﷺ چ مانایەك دەبەخشێت لای ئێمە؟ بۆچی شوێنکەوتنی سونەت هێندە گرنگی هەیە؟

## پێغەمبەرﷺ هەردەم پێغەمبەرە

بەڕێوەبەری قوتابخانەیەك لەناو بینای قوتابخانەکەیدا بەڕێوەبەرە. بەڵام هەر کە چووە دەرەوەی قوتابخانە، بۆ نموونە چووە بازاڕ بۆ کڕینی شمەك و ئیدی لەوێ بەڕێوەبەر نیە. مامەڵەکەشی وەك هەر کەسێکی ئاسایی ناو بازاڕ ئەنجام دەدات نەك وەك بەڕێوەبەرێك.

خۆ کەسیش تامەزۆری ئەوە نیە بزانێت گوایا بەڕێوەبەرێك بە چ جۆرێك مامەڵەی شمەك بکات".

فەرماندەیەکی سەربازی کاتێك لەسەر ئەرکی خۆیەتی و لەگەڵ سوپاکەیدایە فەرماندەیە. لەماڵەوە فەرماندە نیە. کاتێك خەوی دێت و بەرەو جێگای نوستنەکەی دەچێت، وەك هەر کەسێکی ئاسایی–بۆ نموونە وەستایەکی نانەوا– ڕادەکێشێت و دەنوێت.

کەسیش هەوڵ نادات بزانێ گوایا "فەرماندەیەکی سوپا چۆن دەخەوێت؟".

وەلێ نێردراوێکی خودا، هەموو ساتێکی ژیانی هەر نێردراوو پێغەمبەرە نەك تەنیا لەکاتی هاتنی نیگا بۆی و بانگهێشتی

خەڵکی بۆ دینی خوداو وازهێنانیان لە بت پەرستی، بەڵکو لەکاتی کڕین و فرۆشدا هەر پێغەمبەر بوو، لەکاتی نوستندا بەهەمان شێوە..

لە سەروبەندی جەنگدا، لەسەر سفرەی نان خواردندا، لەکاتی ئاو خواردنەوەدا، لەکاتی پەرستشدا، لەوتارداندا، لە پێکەنیندا، لەکاتی گوزەریدا، لە گفتوگۆکردنی لەگەڵ خێزانیدا لەماڵەوە، لەکاتی نزاکردنیدا، لە نوێژکردنیدا، لە ڕۆژوو گرتندا پێغەمبەر هەر پێغەمبەرە.

بۆیە پێغەمبەرمانﷺ هەر کارێکی ئەنجام دابێت وەك پێغەمبەرێك ئەنجامیداوە. هەموو ساتێکی ژیانی بەو جۆرەی شیاوە لەگەڵ پێغەمبەرێکدا چاوەڕێی لێ دەکرێت، بەسەر دەبرد. ژیانی ئەو دوورە لە هەر هەڵەو خەوشێك. چونکە پەروەردگاری زانا خۆی فێری دەکرد چ کارێك و چۆن ئەنجامی بدات. هەرچۆنێك خودا ویستبێتی، پێغەمبەرﷺ هەر بەو جۆرە ژیاوە. ژیانی ئەو خۆشەویسترین جۆری ژیان بوو لای خوای گەورە.

سونەت بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیان بە ژیانی بێ کەم و کوڕی پێغەمبەری ئازیزمانەوەﷺ هەیەو مرۆڤ پێویستە بیانکاتە سەرمەشقی ژیانی خۆی، هەڵسوکەوت، ئامۆژگاری، کارێك بۆ جارێك یاخود بەبێ ناوبڕ هەمیشە ئەنجامی دابێت...

چۆنێتی ژیانی ئەو دەبێتە ستایلی ژیانی ئێمە. بۆ ئەو کەسانەی بە شێوازێك بژین جێگەی ڕەزامەندی پەروەردگار بێت، سونەت بریتییە لە ڕێگەیەکی قەدبڕو ڕووناك و ڕاست. ئەگەر ئێمە بەشێوازێك لەگەڵ سونەتی پێغەمبەردا ﷺ بگونجێت بژین ئەوکات ژیانی ئێمەش لە ژیانی ئەو دەچێت.

تۆ کاتێك کەسێکت خۆشدەوێت، ئیدی هەر کەسێکی دیکەش لەو بچێت هەر خۆشتدەوێت. خودای گەورەش لەبەرئەوەی پێغەمبەری ﷺ خۆشدەوێت–لەبەر خاتری خۆشەویستی ئەو– هەرکەسێکیش ژیانی لە ژیانی ئەو پێغەمبەرە ﷺ بچێت یاخود هەوڵ بدات وەك ئەو بژی، خۆشی دەوێت هەر لەبەرئەمەیە سونەتی پێغەمبەری خودا هێندە گرنگ و بایەخدارە.





## کارگەی پاداشت

شـوێنکەوتنی سـونەتی پێغەمبـەری ئـازیزﷺ ، گـەلێك کـاری ئاسایی ڕۆژانە دەیانکەیت یاخود پێویستە بیانکەیت، دەگۆڕێتـە سەر شێوەی کارگەیەکی پاداشت.

بــۆ نموونــە کاتێــك لــەماڵ دێیتــە دەرەوە، لەبەرئــەوەی پێغەمبەری خودا لەکاتی هاتنەدەرەوەی لەماڵ بە قاچـی ڕاسـت هاتووەتە دەرەوە، بەقاچی ڕاست بێیتە دەرەوە ئـەوا سـونەتێك ئەنجام دەدەیت و دەبیتە خاوەنی پاداشتی سونەتێك.

ئەگەر سـەرەتا تـاکی ڕاسـتی پێڵاوەکانـت لـەپێ بکـەیت ئـەوا ســونەتێك ئــەنجام دەدەیــت و دەبیتــە وەرگــری پاداشــتی سونەتێك.

گـەر پێـت خۆشـە هەنـدێ ڕێگـەی ئاسـانی بەدەسـتهێنانی پاداشتی سونەتت پێ بڵێم:

* بزەکردن بەڕووی هاوڕێکانت.

* کاتێـك چـوویتە سـەر جێگـە لەسـەر لای ڕاسـت ڕابکشـێ (پاشان کە خەوت لێ کەوت کێشە نیە بـە هـەر لایەکدا بکـەویت لەکاتی خەوەکەتدا).

* لابردنی بەردێك لەسەر ڕێگە یاخود هەر شتێکی دیکە بچێت بە قاچی خەڵکیدا.

* ڕووەك ناشتن.

* نان خواردن بەدەستی ڕاست (ئەگەر ڕێگرییەك نەبێت).

* دەست شتن پێش نان خواردن و پاش نان خواردن.

* دەم و ددان شوشتن و پاك ڕاگرتنی هەمیشە.

ئەمـە ئەوانـەن ئێسـتا لـەبیرمن. بێگومـان لـەو پەرتووکانـەی دەربارەی سونەت یـاخود ژیـانی ئازیزمـان نووسـراون دەتوانیـت گەلێك سونەتی دیکە فێرببیت.

هەرکام لەوانە ئەنجام بدەیت ئـەوا تـۆ گوێڕایـەڵی پێغەمبـەرت کردووەو وەك و ئەوت کـردووە. ئـەوەی گوێڕایـەڵی پێغەمبـەرﷺ بکات ئەوا گوێڕایەڵی خودای کردووە.

## سوننەت ژیان جوان دەکات

ئایا شوێنکەوتنی سونەتەکانی پێغەمبەرمانﷺ تەنیا دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی پاداشت؟ هەرچەندە هەر ئەوەندەش بەسە، بەڵکو ئێمە هەر لەم دونیاش پاداشتی هەوڵدانمان بۆ شوێن پێ هەلگرتنی ژیانی سەروەرمان وەردەگرین.

سونەت ژیانی هەموومان جوان و قەشەنگ دەکات..

ئەگەر هەوڵمان بدایە ژیانمان بچوێنین بە ژیانی سەروەرمانﷺ، ئەگەر بەپێی پێویست تەقەلامان بدایە لەپێناوی خستنەڕووی سونەتەکانی پێغەمبەرﷺ کە یەك لەیەك بەپێزترن، ئەوا ئێستا زۆربەی ئەو کێشانەی لەنێوانماندا هەن هەرگیز ڕوویان نەدەدا.

پتر ڕێزمان لە گەورەکانمان دەگرت و بچووکەکانمان زیاتر خۆشدەویست. ئەوکات ئیدی دایك و باوکی بەساڵاچووی هەژار کە هەمیشە چاولەڕێی ڕۆڵەکانیان بەدڵی ڕەنجاویانەوە لە خەڵوەتگەکانی پیریدا چاوەڕێی مەرگیان نەدەکرد.

دراوسێکان یەکتریان خۆشدەویست و هەموو کەسێك لە هاوسێکەی دڵنیا دەبوو. ئەوکات هیچ خانەوادەیەك خەو نەدەچووە چاوی گەر دراوسێکەی برسی بوایە.

پردی چاکەو یارمەتی لەنێوان هەژارو داراکاندا دروست دەبوو.

کرێی کرێکاران بەر لـە وشـك بوونـەوەی عـارەقی نێوچـاوانیان دەدرا.

هەرگیز لە کوچەو کۆڵانەکاندا کەسانی بێلانەو قژو ڕیش درێژی هەژار نەدەبینرا.

ئەمانـەو چـەندینی دیکـە لـە جوانیـەکانی ژیـان و سـونەتە قەشـەنگەکانی ئـەو زاتـەﷺ وەك تیشـکی ڕۆژ لـە ژیـانی هەریەکێکماندا شەوقی دەدایەوە.

لەکۆتاییـدا نموونەیـەکت بـۆ دێنمـەوە کـە خـۆت بـە هـەموو بڕوایەکتەوە دانی پێدا بنێیت و بڵێیت:"بەخودا وا دەبوو!".

ئەگـەر بێـت و بـە تـەواوی لـە بابـەت و پـاك و خـاوێنی دەم و ددانـدا سـونەتی پێغەمبـەرمانﷺ بـەجێ بهـێڵین، ئـەوا ئێسـتا نەماندەتوانی ئامـاژە بـۆ کەسـێك بکـەین کـە ددانـی کلـۆر ببێـت یاخود ڕزابێت!

تۆ دەڵێی چی؟ بەڕای تۆش وانیە؟



## ئایا پێغەمبەرمانﷺ لەم سەردەمەدا لە ژیاندا بوایە ددانەکانی بە سیواك پاك دەکردەوە یاخود فڵچەی ددانی بەکاردەهێنا؟



بە پێویستی دەزانم یەك دوو خاڵت وەبیر بهێنمەوە لە چوارچێوەی وەڵامی ئەم پرسیارەتدا، کە ئەم بەیانییە لەکاتی ددان شتندا هاتووەتە بیرت.

لەپرسیارەکەدا دەڵێیت: "ئەگەر پێغەمبەرمانﷺ لەم سەردەمەدا بژیایە..." بەڵام پێغەمبەر ئەمڕۆ لەژیاندا نیە. ئەو ئیدی لەنێوانماندا نیە.

هەرچەند بیری ئەو بکەین، هەرچەند پێویستمان بە بوونی ئەو هەبێت لەنێوانماندا، هەرچەند تامەزرۆی بینینی ئەوو دانیشتن لە خزمەتی ئەودا ببین، هەرچەند تاسەی ئەوەمان کردبێت بەدەستە بۆنخۆشە گوڵ ئاساکانی –بە وێنەی منداڵانی

مەدینە- دەستبهێنێت بەسەرمانداو بە زەردەخەنە مانگ ئاسایەکانی شەوگارمان ڕوون بکاتەوە، وەلێ پێغەمبەری ئازیزمان و سەرداری گەردوون چیتر لەنێوانماندا ناژی.

هەر بۆیە پرسیارێك کە بە دەستەواژەی "ئەگەر پێغەمبەرمانﷺ لەم سەردەمەدا لە ژیاندا بوایە" دەست پێ دەکات وەلامەکەشی پێویستە بەمە دەست پێ بکات:"بەلام خۆ ئەمڕۆ پێغەمبەرمانﷺ لەنێوانماندا ناژی".

چونکە گەر پێغەمبەرمانﷺ لەم سەردەمەدا لەژیاندا بووایە، ئەوا دونیا وەهای بەسەر نەدەهات.

دونیایەکی زۆر جیاواز و بێگومان ژیانێکی گەلێ قەشەنگ بوونی دەبوو..

ئەم سەردەمە دەبووە (سەردەمی خۆشگوزەرانی) هەروەها لە دونیایەکی وەهادا تۆ بەسروشتی نەتدەتوانی ئەم پرسیارە بکەیت. چونکە وەلامەکەیت دەزانی.

ئەوکات وەك هاوەڵە بەڕێزەکان-ئەو هاوەلانەی کاتێك سەرگوزەشتەی ژیانیان دەخوێنینەوە ئیرەییان پێ دەبەین و دەخوازین ئێمەش یەکێك بووینایە لەوانە و لەوێ بووینایە- شێوازی ژیانی ئەومان دەبینی و دەمانزانی چی و چلۆن ئەنجام دەدات. هەروەها هەوڵمان دەدا وەك ئەو بژین.

دەمەوێت ئەوەت وەبیر بهێنمەوە کە:

هەمیشە بچووکەکان دەچنە لای گەورەکان. هیچ کات گەورە ناچێتە لای بچووکەکان. هەروەها بانگکردنی گەورەکان لەلایەن بچووکەکانەوە بۆ لای خۆیان کارێکی گونجاو نیە.

کەواتە کاری دروست ئەوەیە کە لەبری هەوڵدان بۆ هێنانەوەی پێغەمبەرمانﷺ بۆ ئەم دەورە، گێڕانەوەی خودی خۆمانە بۆ (سەردەمی خۆشگوزەرانی) ئەگەر چی بە خەیاڵیش بێت تاکو ببینین و بزانین سەروەرمان چۆن گوزەرانی کردووە ئەمەش لەڕێگەی خوێندنەوەی پەرتووکی ژیانی ئەو و فەرموودە پیرۆزەکانی بە کورتی، ڕاستترە لەبری ئەوەی بلێین"ئەگەر پێغەمبەرمان ئەمڕۆ بژیایە ئەو کارەی چۆن ئەنجام دەدا" بپرسین:"ئایا پێغەمبەرﷺ بە چ شێوەیەك ئەم کارەی ئەنجام داوە؟".

من ناتوانم بەناوی ئەوەوە قسە بکەم و وەڵام بدەمەوە:"ئەگەر پێغەمبەرﷺ ئەمڕۆ بژیایە ئەوا ئەم کارەی بە فلانە جۆر ئەنجام دەدا!".

هەروەها ئەم جۆرە پرسیارانە کۆتاییان نایەت. وەڵامی یەکێکیان دەدەینەوە لەپڕ پرسیارێکی دیکە سەردەردێنێت.

"باشه ئەدی دەچوو بۆ سەیری تۆپ تۆپێن؟ دەبووە هاندەری تیپێك؟ ئەگەر دەبووە هاندەر، كام تیپەی هەڵدەبژارد؟....".



وەك كەمێك بەر لەئێستا ئاماژەم پێكرد ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە فێربوونی چۆنێتی ژیان و هەڵسوكەوتی پێغەمبەری ئازیزمانە ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ هەڵسوكەوتی لەگەڵ هاوەڵانیدا چۆن بووە؟ لەماڵەوە بە چییەوە سەقاڵ دەبوو؟ نێوانی لەگەڵ منداڵاندا

چۆن بـوو؟ چـۆن دەیخـواردو دەیخـواردەوە؟ چـۆن نوێـژەکانی دەکـرد؟ لـەکاتی گفتوگـۆ، پێکـەنین، ڕۆیشـتن، شـۆخی کـردن، نوستن دا،... حسابی بۆ چی دەکرد؟

بەڵێ، پێویستە ئەمانە بزانین و تیشکێك وەربگرین لـەو خـۆرە مەزنەی ژیانی ناوازەی سەروەرمان کە هـەموو سـەردەمەکان لـە تاریکی ڕزگار دەکات.

## ئەدی باشە من فلّچەی ددان بەکاربهێنم یاخود سیواك؟

چەند هەفتە پێشتر لەگەڵ هاوڕێکانمدا لێرەو لەوێ باس و خواسمان دەکرد. قسە هات و چوو، بابەتەکە گەیشتە سەر بابەتی تەندروستی دەم و ددان. هەموو دەمانزانی پێغەمبەری خوداﷺ لە بابەتی پاك و خاوێنی دەم و دداندا چەندە هەستیار بووە و چۆن ئامۆژگاری موسوڵمانانیشی کردووە بۆ خاوێن ڕاگرتنی. وەلێ کێشەیەك لە ئارادا بوو:

پێغەمبەرﷺ ددانەکانی بە سیواك پاك دەکردەوە. لەو سەردەمەدا ماجونی ددان و فلّچە نەبوون. بەڵام ئەمڕۆ هەیە، بگرە دەزووی ددان پاككەرەوە، فلّچەی کارەبایی و ئامێری شتنی دەم و ددان بوونیان هەیە. شان بەشانی ئەمانەش بێگومان سیواك هەیە.

باشە ئەدی ئێمە -کە هەوڵ دەدەین ڕێچکەی پێغەمبەری نازدارﷺ بگرین و گەرچی کەمیش بێت وەك ئەو بژین- چلۆن ددانەکانمان پاك بکەینەوە؟

بە فلّچەی ددان و هاوشێوەکانی یاخود بە سیواك؟

یەك لە هاوڕێکانم وتی:

"بێگومـان دەبێـت فڵچـەی ددان بـەکاربهێنین چـونکە کـاتی سیواك بەسەرچووە!"

یەکێکی دیکە:

"نـەخێر هــەرگیز! لەبەرئــەوەی پێغەمبــەرمانﷺ ســیواکی بەکارهێناوە ئێمەش دەبێت سیواك بەکاربهێنین!".

یەکێکی دی ئەگەریش لەبەر خاتری هێورکردنەوەی گفتوگۆکـە بووبێت وتی:

"باشتر وایە ئێمە ماجونێك بەکاربهێنین کـە مـاددەی سـیواکی تێدابێت".

بەو جۆرە پێـی وابـووە چارەسـەرێکی گونجـاوی مامناوەنـدی دۆزیوەتەوە.

بەرامبەر ئەمە هەموو پێکڕا دەستمان کردە پێکەنین! چـونکە هەموو ڕیکلامن، ئەو ماجونەمان هاتەوەبیر کە سیواکی تێدایـە و ساڵی پار لە تەلەفزیۆن پەخشکرابوو.

تۆش ئەو ڕیکلامەت وەبیر دێت؟

هەرکەسێك سەردانی خزمێك یاخود ناسراوێکی کردبێت کـە لـە (حەج) یاخود (عـومرە) هاتبێتــەوە زۆرباش دەزانێـت دەرختـی (سیواك) درەختێکە لە وڵاتـی خۆمـان ناڕوێـت. وانیـە؟ تـۆ تـاکو ئێستا بینیوتە لەباخچەی ماڵێکدا درەختی(سیواك) ڕووابێت؟

بۆیە هەندێك ریکلام دەکرێت لەسەر کەناڵەکان هەڵەی تێدایەو وا دەردەکەوێت بینەر بە گەمژە بزانن. وەلێ قسەیەك هەیە دەڵێت:"خراپترین گەمژەیی ئەوەیە خەڵکی بە گەمژە بزانیت!".

ئەگەر من دەرهێنەری ئەو ریکلامە بوومایە ئەوا بەم جۆرە دەبوو. پیرەمێردەکە ئامۆژگاری کوڕەزاکەی دەکات و دەڵێت:

"بڕوانە ڕۆڵەکەم، ئەمە ناوی (سیواك)ە. پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بۆ خاوێن کردنەوەی دەم و ددان زۆر گرنگی پێدەدا. وە فەرمانیشی بە ئێمە کردووە تاکو دەم و ددانمان پاکژبکەینەوە. بەڵێ پێغەمبەرمانﷺ ددانەکانی بەم سیواکە پاك دەکردەوە..".

دەزانم! دەزانم! دەزانم!

دەزانم هێشتا وەڵامی تەواوی پرسیارەکەتم نەداوەتەوە!

دەزانم حەزدەکەیت بزانیت بیروبۆچوونی من چی بوو لەمیانەی ئەو گفتوگۆیەی نێوان هاوڕێکانمدا.

هیچ شتێکم نەوت!



دەتوت لەناو مێشکمدا دەرچەی دەفرێکی پڕ لە مێرووولە لادراوە. و هەموو مێرووولەکانی ناو دەفرەکە خەریکە بڵاودەبنەوە بەملاولای مێشکمدا.

پێویست بوو وەڵامێک بۆ پرسیارەکە بدۆزمەوەو مێرووولەکانیش بگەڕێنمەوە بۆ جێگەی خۆیان. ئەگەرنا مێشکم گەلێك ئازاری دەچەشت.

دەبووایە من چیم بکردایە؟ ددانەکانم بەسیواك یاخود بە فڵچە پاکژبکردایەتەوە؟ ئەنجامدانی کامیان شوێنەکەوتنی سونەتی پێغەمبەر بوو؟

ئەو شەوە پرسیارێکم ئاڕاستەی خۆم کردەوە:

"ئایا بۆچی پێغەمبەرﷺ سیواکی بەکاردەهێنا؟".

وەڵامەکەی ئاسان بوو:

"بێگومان بۆ پاککردنەوەی ددانەکانی!".

دواتر پەڕەیەك کاغەزم هێنا و لەناویدا بازنەیەکی گەورەم کێشا. لەناوەڕاستیدا بە گەورەیی نووسیم"سونەتی ددان پاك کردنەوە".

بەڵێ، گرنگیدان بە خاوێن کردنەوەی دەم و ددان کارێك بوو پێغەمبەرﷺ هەرگیز فەرامۆشی نەکردووە سونەتێکی هەمیشەیی بووە لای. زوو زوو هاوەڵانیشی ئاگادار دەکردەوە، داوای لە گەلەکەی دەکرد هەمیشە بە تەنگ خاوێنی ددانیانەوە بن.

ئەگەر من بە سیواك، دەزووی ددان، فڵچەی ددان یاخود هەر کەرەستەیەکی دیکە لە داهاتوودا دروست بکرێت ددانەکانم پاك بکەمەوە، لەکاتی پاککردنەوەدا بیرم بێت و بزانم کە ددان پاککردنەوە سونەتێکی پێغەمبەرە ئەوا دەچمە بازنەی جێبەجێکارانی "سونەتی ددان شتن"ەوەو دەبوومە ئەنجامدەری سونەتێکی سەروەرمان کە ژیانێکی تەندروست بۆ مرۆڤ فەراهەم دەکات. إن شاء الله خودای گەورەش لەبەر ئەنجامدانی سونەتێکی پاداشتم دەداتەوە.

زۆرباشـــه، بــه پاككردنـــه‌وه‌ی ددانـــه‌كانم ده‌بوومـــه خـــاوه‌نی پاداشـــتی ســـونه‌تێك چـــونكه پێغه‌مبـــه‌ر ﷺ ددانـــه‌كانی پـــاك ده‌كرده‌وه.

ئـه‌دی باشـه، ئه‌گـه‌ر ئـه‌م كـاره‌م بـه سـیواك ئـه‌نجام بدایـه چ ده‌بوو؟

له‌ناو ئه‌و بازنه‌یه‌ی كێشابووم بازنه‌یـه‌كی دیكـه‌م كێشـاو نـاوم لێنا"سونه‌تی خاوێن كردنه‌وه‌ی ددان به سیواك".

ئه‌گه‌ر من به سیواك ددانه‌كانم پـاككرده‌وه ئـه‌وا لـه‌ناو بازنـه‌ی (ئه‌نجامده‌رانی سـونه‌تی ددان شـتن)ده ده‌چـوومه چوارچـێوه‌ی بازنه‌یـه‌كی زۆر تایبـه‌تتر كـه بازنـه‌ی ئه‌نجامـده‌رانی (سـونه‌تی خاوێن كردنه‌وه‌ی ددان به سیواك).






بازنـــەی (ســـونەتی خـــاوێن کردنـــەوەی ددان بـــە ســـیواك) جێگەیەکی تایبەتی هەبوو لەناو بازنەی (سونەتی ددان شـتن)دا. ئەوانەی دەکەونە نـاو ئـەم بازنەیـەوە—لەبەرئـەوەی بـە سـیواك ددان خـاوێن دەکەنـەوە— شـیاو هەڵسـوکەوت دەکـەن بـەپێی سونەتی پێغەمبەرﷺ.

ئەو شەوە بڕیارمدا! وەك چەند ساڵی پێشوو بەردەوام دەبم لـە ددان شـتن بـەیانیان و ئێـواران بـە فڵچـەو مـاجون. چـونکە پاککردنەوەی ددانم بەم جۆرە ئاسانتر بوو بۆ مـن. پێغەمبـەری نـازدارﷺ لـە هەڵبـژاردنی یـەکێك لـە کـۆی دوو هەڵبژاردنـدا— بەمـەرجێك تووشـی گونـاه نـەبێت— ئاسـانەکەیانی هەڵدەبژارد،

بەڵام بڕیارمدا لەماوەی کورتدا سیواکێکی تازەی ڕێك و پێك دەست بخەم، چونکە پێغەمبەرﷺ ددانەکانی بە سیواك خاوێن دەکردەوە. ئەمە سونەتی ئەو بوو. گەلێك ئامۆژگاری گەلەکەشی کردووە بۆ بەکارهێنانی سیواك. چەندین فەرموودەش سەبارەت بەوە هەیە.

## دەربارەی سیواك

لەڕۆژانی داهاتوودا ئیدی سەبارەت بە سیواك زیاتر تامەزرۆ دەبووم بەگوێرەی ئەوەی پێغەمبەری زانا سیواکی هەڵبژاردبوو بۆ خاوێن کردنەوەی ددان، دەبێت گەلێك حیکمەتی تێدابێت.

دەرئەنجامی بەدواداچونێك لە ئینتەرنێت و پەرتووکەکانی کتێبخانەکە گەلێك زانیاری سەرسوڕهێنەرم دەست کەوت.

سیواك ڕووەکێك بوو لە چەندین سەدە پێش ئێستاوە لەلایەن مرۆڤەوە بەکارهێنراوە بۆ خاوێن کردنەوەی دەم و ددان، لە لقی درەختی (ئەراك)ەوە، دەستەبەر دەکرێت. لەناوچە گەرمەکاندا–هەر لە ڕۆژهەلاتی ئەفریقاوە تا هیندستان– ئەم ڕووەکە دەڕوێت.



له ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا دەرئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی ئەنجام دراون، دەرکەوتووە سیواك هێندە بەسوودە بۆ مرۆڤ بە ئەندازەیەك کە هیچ فڵچەو مەعجونێك تاکو ئێستا هێندە بەسوود نەبووە.

سیواك تەنیا ددان پاکژ ناکاتەوە، بەڵکو پوکی ددانیش بەهێز دەکات. لەبەرئەوەی بۆنی سیواك دەبێتە هۆی زیادبوونی

دەردانی شلەمادەی (لیك) لەناو دەمدا، ڕێگە لە وشك بوونـەوەی پـوك دەگرێـت. ئەمــە ســەرەڕای ئــەوەی بکــوژی میکرۆبــی زیانبەخشە.

ڕیشاڵەکانی بە وێنەی پارچە پـاقلاوە لـە کریسـتاڵی ڕووەکـی پێکهاتووە، ئەمە وای لێکردووە کە ئەگەر بەراورد بکرێت لەگـەڵ فلچەدا لەبارەی توانای پاككردنەوەوە، ئەوا سیواك چەندین جـار توانای بەرزترو وردترە.

ئەم ڕیشاڵانە هەروەك چۆن بەباشـی ڕووکـاری ددانـەکان پـاك دەکەنەوە، لەهەمان کاتدا خۆیان دەخزێننە نێوان ددانەکانـەوەو ڕۆڵــی پــەتی ددانـیش دەبیـنن. ئـەو بەشــەی ســەری ســیواك بــەکاردەهێنرێت پێویســتە هەفتــەی جارێـك ببڕدرێـت و نـوکی تازەی بۆ دروست بکرێت.بـەم جۆرەش وەك ئـەوە وایـە هـەموو هەفتەیەك فلچەیەکی نوێ بەکاربهێنیت! ئەوە سەرەڕای ئـەوەی هیچ پارەیەکی زیادە لەگیرفانت دەرناچێت، ئەمە لەگەڵ ئـەوەی خەرجی مەعجونی ددانیشت نابێت!

لەگــەڵ هــەموو ئەمانــەدا ســیواك وەك فلچــەو مــاجون نیــە لەکارگەکانـدا لـە چـەندین مـاددەی کیمیـایی دروسـت بکرێـت. ڕووەکێکـە لـە ڕووەکـە بـەدیهێنراوەکانی خـودای باڵادەسـت. سروشتییە، بێ خەوشەو چواردەوریش پیس ناکات...خۆ تـەنیا

ئەمەش بێت بەسە بۆ ئەوەی سیواك هەڵبژێرین بەسەر فلّچەی ددانندا! لە جیهانێکی وەهادا کە ماوەی (٥٠) ساڵی ڕابردوو، مرۆڤەکانی سەرقاڵ کردووە بە توێژینەوە سەبارەت بە تەندروستی دەم و ددان و هەوڵی دروستکردنی کەرەستەی باشترو پێشکەوتووتر، پێغەمبەرە گوڵەکەی من پێش زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ فەرمانی کردووە بە مرۆڤ ددانەکانیان بە سیواك پاکژ بکەنەوە. بگرە فەرمانەکەشی چەند جار دووپات کردووەتەوە. "ئامۆژگاریم بۆ ئێوە سەبارەت بە سیواك کردن زۆر دووبارە کردووەتەوە. سیواك بەکاربهێنن. چونکە سیواك کەرەستەیەکە دەمتان پاکژ دەکاتەوە و خوداشتان لێ ڕازی دەکات". دواجارە پاش چەندین سەدەو لە سەردەمی زانست و تەکنەلۆژیادا کە چەندین مانگی دەستکرد بەدەوری هەسارەکانداو لە بۆشایی ئاسماندا دەخولێنەوە لە گرنگی تەندروستی دەم و ددان تێگەیشتن. وەلێ هەرگیز نەیانتوانیوە فلّچەیەکی سروشتی و تەندروست لەگەڵ ئەوەشدا فلّچەیەك پێویستی بە ماجون نەبێت دروست بکەن.

